زنجیرەی کتێبی زانستی ١٧/

# بنەماکانی شێرپەنجەی گەدە ڕیخۆڵەیی تیرۆید، مەمك و پرۆستات







د. حەسەن شەتەوی و
د. کامەران ئەمین ئاوە

غەزەلنووس

# بنەماکانی شێرپەنجەی گەدە ڕیخۆڵەیی تیرۆید، مەمک و پرۆستات

د. حەسەن شەتەوی، د. کامەران ئەمین ئاوە

غەزەلنووس

له زنجیره بڵاوکراوەکانی
ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرەی کتێب: **(٢٢٣)**
زنجیرەی کتێبی زانستی: **(١٧)**

# بنەماکانی شێرپەنجەی گەدە
# ڕیخۆڵەیی تیرۆید، مەمک و پرۆستات

**نووسینی:** د. حەسەن شەتەوی و د. کامەران ئەمین ئاوە

- بەرگ: باسم رەسام
- نەخشەسازیی ناوەوە: غەزەلنوس
- ڕینووس و هەڵەچنی: غەزەلنووس
- بابەت: زانستی
- چاپ: یەکەم
- چاپخانە: تاران
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: (٧٠٠٠) دینار
- بڵاوکار: ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە



**سلێمانی- مەیدانی پاسەکانی تووی مەلیک- نهۆمی زەمینی بازاڕی کتێب**
**ژمارەی تەلەفۆن: ٠٧٧٠٣٥٧٣٧٥٧**
www.xazalnus.com

# بنەماکانی شێرپەنجەی گەدە
# ڕیخۆڵەیی تیرۆید، مەمک و پرۆستات

نووسینی
د. حەسەن شەتەوی
د. کامەران ئەمین ئاوە

چاپی یەکەم
٢٠١٨

# پێرست

# پێشەکی

ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە کە گەشەسەندنی زمانی زگماکی دەورێکی بەرچاو لە دروستکردنی نەتەوە، یەکگرتوویی خەڵک و بردنەسەرەوەی ئاستی ئاگایی سیاسی، کولتووری و زانستی و... دەگێڕێ. گەلی کورد بە هۆی دابەشبوونی وڵاتەکەی لە زۆر لە مافە ڕەواکانی خۆی، یەک لەوان گەشەسەندنی زمانەکەی، بێبەش کراوە. کورد ئەگەرچی بەردەوام لەژێر گوشار و سیاسەتی سەرکوت، تواندنەوە و کۆمەڵکوژیی داگیرکەراندا بووە، لە تەواوی بەشەکانی کوردستاندا شوناسی نەتەوەیی، کولتوور، داب و نەریت و مێژووی خۆی پاراستووە و تێکۆشاوە ئەم میراتە بۆ وەچەی دادێ ڕاگوێزێ. بێگومان ئەم ڕەوتە ڕێگەیەکی ساف و بێلەمپەر نەبووە. زمانی فەرمیی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان تا ڕادەیەک کاریگەریی نەرێنییان لەسەر زمانی کوردی داناوە. ڕەگەزپەرستەکان ویستوویانە بە ناوبردنی زمانی کوردی بە "زاراوە"، بایەخی ئەم زمانە کەم بکەنەوە، بەڵام سەرەڕای نەبوونی "زمانێکی یەکگرتوو و ستاندارد"، زمانی کوردی یەکێکە لە دەوڵەمەندترین زمانەکان و هەبوونی پێنج زاراوەی کوردی کە هەر کام لە مەڵبەندێکی بەریندا گەشەی کردووە، نەک هەر زەبری لە زمانەکە نەداوە، بەڵکو زمانی کوردیی لەچاو زمانەکانی دیکەدا دەوڵەمەندتریش کردووە. دابەشکردنی کوردستان، نەبوونی ئاکادێمیا و فەرهەنگستانی زمانی کوردی بەشێکن لە بەربەستەکانی گەشەسەندنی زمانی زانستیی کوردی، لە لایەکی دیکەشەوە، بەشێک لە ڕووناکبیران و دەسەڵاتدارانی کورد ئەوەندەی بایەخ بە فێربوونی زمانی بیانی دەدەن، بایەخ بە گەشەپێدانی زمانی کوردی لە بواری زانستیدا نادەن، جاری وا هەیە ئەگەر کەسێکیش بیەوێ لەم بوارەدا کارێکی جیددی بکا، بەبێ پاڵپشت و پشتیوان دەمێنێتەوە.

ئەمە ڕاستییەکی تاڵە و بەپێی قسەیەکی نەستەقی ئەڵمانی "ڕاستی تاڵە، بەڵام ناحەز و بێتام نییە."

کتێبی "بنەماکانی شێرپەنجەی گەدە - ڕیخۆڵەیی..." هەوڵێکی سەرەتاییە بۆ نووسینی کتێبی پزیشکی بە زمانی کوردی. ئەم کتێبە بەپێی کەڵکوەرگرتن لە زۆربەی سەرچاوە زانستییە تازەکانی جیهانی پزیشکی بە ئینگلیزی و ئەڵمانی، هەروەها ئەزموونی کاری نووسەران و بە تایبەتی کاری دەیان ساڵەی پزیشک حەسەن شەتەوی، سەرۆک و بەرپرسی پێشووی بەشی نەشتەرگەریی شێرپەنجە و کۆلۆپرۆکتۆلۆژی "کلینیکۆم نۆرد"[1] سەر بە زانستگای پزیشکیی شاری ئەسێنی ئەڵمان، ئامادە کراوە. دیارە ئەوەی لێرەدا خراوەتە بەرچاو، تەنها بەشێکی تایبەت لە شێرپەنجەناسی لە خۆ دەگرێ. نووسینی کارێکی گشتگیرتر کە بەشەکانی دیکەی ئەم زانستە لە خۆ بگرێ، پێویستیی بە کاری هاوبەشی پسپۆڕانی بواری پزیشکی و پاڵپشتیی ڕێکخراوەیەکی دەوڵەتی یان مەدەنی هەیە. بەو هیوایەی ئەو کارە ببێتە بەردی بناغە و پسپۆڕانی گەلەکەمان بینای ڕازاوەی ماڵی کوردیی لە سەر هەڵبچنن.

نووسەران سپاس و پێزانینی خۆیان ئاڕاستەی بەڕێز پرۆفیسۆر "کلاوس دیتێر گێرهارتس"[2]، سەرۆکی ئەنیستیتووی پاتۆلۆژی لە نەخۆشخانەی بتێزدای شاری دویسبورگ لە ئەڵمان، بۆ ناردنی بەشێک لە وێنەکانی هیستۆپاتۆلۆژی دەکەن.

**د. حەسەن شەتەوی، د. کامەران ئەمین ئاوە**

**خاکەلێوەی ٢٠١٦ی زایینی، ئەڵمان**

---

[1] Klinikum Nord

[2] Prof. Dr. med. Claus Dieter Gerharz

# بەشی یەکەم

## شێرپەنجەی قوریژنک[٣]

## پەتاناسی[٤]

کارســـینۆمی قوریژنک[٥] (ســـورینچک) حەوتەمین هۆی مردنە بە هۆی شـــێرپەنجەوە لە جیهاندا. لە باکووری ئێران، بەشـــێک لە ناوچەکانی باشـــووری ڕووســـیا و باکووری چین لەوە دەچێ لە هەر ١٠٠٠٠٠ کەس، ٨٠٠ کەس تووشی ببن. ٩٥٪ی کارسینۆمی قوریژنک لە جیهاندا لە چەشـنی خانە پوولەکەدارەکانە (سـکواموس سـێڵ)[٦]. ئەم چەشـنە کـارســـینۆمە لە ئەڵمـان نزیکەی ٨٠٪ی تەواوی کـارســـینۆمەکـانی قوریژنـک و لە وڵاتە یەکگرتووەکـانی ئەمەریکـا نزیکەی ٤٠٪ لە خۆی دەگرێ. ناســـراوترین ناوچەکانی ســـەرهەڵدانی کارســـینۆمی خانە پوولەکەدارەکان بریتین لە فەڕانســـە، باکووری ئێران، باکووری چین، ژاپۆن، تورکمانسـتان، باشـووری ئەفریقا و شـیلی. ڕادەی سـەرهەڵدانی ئـادنۆکـارســـینۆمی قوریژنـک[٧] لە ئەمەریکـا نزیکەی ٦٠٪ی تەواوی کارســـینۆمەکانی قوریژنک و لە ئەڵمان نزیکەی ٢٠٪ە. ئەم چەشـــنە

---

[3]Esophageal cancer
[4]Epidemiology
[5]Esophageal Carcinoma
[6]Squamous-cell carcinoma
[7]Adenocarcinoma

کارســــینۆمە زۆرتر لە پیاوانی ســــپێپێســــتدا دەبینرێ و پێوەندیی ڕاستەوخۆی لەگەڵ سیندرۆمی بارێت[8] هەیە. کارسینۆمی قوڕیژنک لە وڵاتە ڕۆژئــاواییەکــان بە دەگمەن دەبینرێ. بە هۆی جیــاوازییەکی بەرچاو لە ڕێژەی ســــەرهەڵدانی ئەم نەخۆشــــییە، نەک تەنها لەباری جوگرافیایی، بەڵکو لەباری ناوچەییشــــەوە ناکرێ بە دڵنیاییەوە باســـی ڕێژەیەکی جێمتمـانە بکرێ. دەیەی پێنجـەم و شــــەشــــەمی تەمەن ســـەرلوتکەی ســـەرهەڵدانی ئەم نەخۆشـییەیە. لە وڵاتە ڕۆژئاواییەکاندا ڕادەی ســــەرهەڵدانی لە پیاواندا ٤ قات زۆرترە لە ژنان. بە گشــــتی، ڕادەی ســــەرهەڵدانی ئادنۆکارســــینۆمی قوڕیژنک بەرەو زۆربوون و شــــێرپەنجەی خانە پوولەکەدارەکانە و کارســــینۆمی بـارێت بەرەو دابەزین دەچێ.




## هۆ و فاکتەرە ڕێخۆشکەرەکان

کـــێشــــانـــی لەڕادەبەدەری تـــووتـــن و زۆرخــــواردنەوەی ئەلکول، هەروەهـا ڕەفـــــلاکـــــس ئەزۆفـاگـیـت[9] لە فــــاکـــــتەرە بەرچـــاوەکـــانـــی ســــەرهەڵـــدانـــی

---

[8]Barrett's Syndrome

[9] Gastroesophageal reflux disease

شـــێرپەنجەن.[10] فاکتەرە ڕێخۆشـــکەرەکانی دیکە بریتین لە: ئاشـــلازیای[11] درێژخایەن، زەبرویێکەوتنی ســـەختی قوریژنک بە هۆی کاریگەریی مادەگەلی ئەســـیدی یـان قەڵیـایی[12]، تەنگیی درێژخـایەن بە هۆی جۆراوجۆرەوە، "سیندرۆمیپلومر – وینسـۆن"[13] لە کەمخوێنیی ئاسـندا، کاریگەریی نیترۆزئەمین، پاپیلۆماڤایرۆسـەکان (HPV 16)، پاش تیشکدەرمانیی ناوچەی قوریژنک بۆ وێنە بە هۆی شـــێرپەنجەی مەمک و خواردنەوەی چایی یان شـلەمەنیی زۆر گەرم. لەوە دەچێ خواردنی درێژخایەنی ASS و NSAR پێشـگیری لە سـەرهەڵدانی شێرپەنجەی قوریژنک بکا.

## قەوارە و کاری قوریژنک

قوریژنک بۆرییەکی ماســـوولکەییە بۆ گواســـتنەوەی خواردەمەنی لە دەمەوە بۆ گەدە. ئەم ئەندامە لە ماســـوولکەی خەتدار[14] (یەک لە ســێ پرۆکسـیمال[15]) و ماسـوولکەی سـاف[16] (دوو لە سـێ دیسـتال[17]) پێک هاتووە و دوو تەسکیی هەیە، تەسکیی سەرەوەی قوریژنک[18] [لە کاتی ڕۆچوونی پاروو بۆ نێو قوریژنک دەکرێتەوە و پاشـــان بە خێرایی دەبەســـترێتەوە هەتا پێشـــگیری لە ئاســـپیراســـیۆن[19] بۆ نێو بۆریی هەناسە بکا] و تەسکیی خوارەوەی قوریژنک[20] [لە سەرەتای قووتدانی پاروو و خواردنەوەدا دەکرێتەوە و هەتا کاتی ڕۆچوونی پاروو بۆ نێو گەدە کراوە دەمێنێتەوە، پاشـــان دەبەســـترێ هەتا پێشـــگیری لە

---

[10] Carcinogenic
[11] Achalasia
[12] Acid - base
[13] Plummer – Vinson Syndrome
[14] Striated muscle
[15] Proximal
[16] Smooth muscle
[17] Distal
[18] Upper esophagal sphincter
[19] Aspiration
[20] Lower esophageal sphincter

گەڕانەوەی مـادەی خوراو لە گەدەوە بۆ نێو قورێژنک بکا]. قورێژنک لە ڕوانگەی ئاناتۆمییەوە (قەبارەییەوە) بەم چەشنە دابەش دەکرێ:

**١. قـوریـژنکـی ملـی**[٢١]: لە لـیواری خـوارەوەی کـرکـرەی ئەڵقەیـی (قوڕگەوە)[٢٢] هەتا ئاسـتی چوونی قورێژنک بۆ نێو ڕکەی سینگ لە خۆ دەگرێ. لیمفەگرێ ناوچەییەکان[٢٣] بریتین لە مل[٢٤] و ژێرچەڵەمە[٢٥].

**٢. قورێژنکی نێو ڕکەی سینگ:**[٢٦]

* **بەشـی سـەروو:** لە ئاسـتی چوونی قورێژنک بۆ نێو ڕکەی سـینگ هەتا شوێنی دوولقبوونی قامیشەی ڕێگەی هەناسە (هەفیک)[٢٧] لە خۆ دەگرێ.

* **بەشـــی نێوەڕاســـت:** لە ئاســـتی نیوەی ســـەرووی نێوان دوولقبوونی قامیشەی ڕێگەی هەناسە و شوێنی بەیەکگەیشتنی قورێژنک و گەدەدایە[٢٨].

* **بەشـــی خواروو:** لە ئاســـتی نیوەی خوارووی نێوان دوولقبوونی قامیشـەی ڕێگەی هەناسـە و شـوێنی بەیەکگەیشـتنی قورێژنک و گەدە، هەروەها ئەو بەشەی قورێژنکدایە کە دەکەوێتە نێو سک.

لیمفەگرێ ناوچەییەکان بریتین لە لیمفەگرێکانی نێوان ســـییەکان[٢٩] و دەوری گەدە[٣٠] بەبێ لەبەرچاوگرتنی لیمفەگرێکانی پەیکەری بۆشـــایی سـک[٣١] (یان خوێنبەری بۆشـایی سـک). لە ڕوانگەی نەشـتەرگەرییەوە بـایەخ بە دوو بەشـــی قورێژنـک، واتە نیوەی ســـەرەوە و نیوەی خوارەوەی هێڵێکی خەیاڵی دەدرێ کە بە پانایی شـــوێنی دوولقبوونی قامیشەی ڕێگەی هەناسەدا تێپەڕ دەبێ.

---

[21] Cervical esophagus
[22] Cricoid
[23] Regional Lymph Nodes
[24] Cervical lymph nodes
[25] Supraclavicular lymph nodes
[26] Thoracic esophagus
[27] Tracheal bifurcation
[28] Oesopagusgastric junction
[29] Mediastinum
[30] Pergastric
[31] Truncus coeliacus, The celiac (or coeliac) artery

## پاتۆلۆژی

چەمکی کارسینۆمی قوریژنک تەواوی شێرپەنجەکانی ئیپیتەلیۆمی (تان و پۆی ڕووپۆشــی) قوریژنک لە خۆ دەگری. ٩٥٪ی شــێرپەنجەکانی قوریژنک لە چەشــنی خانەپوولەکەدارەکان و ئادنۆکارســینۆمن. چەشــنەکانی دیکە کە بە دەگمەن دەبینرێن و بریتین لە: کارســینۆمی ئادینۆید ســیســتیک[32] (لە ٠,٥٪ هەتا ١٪ی بوارەکان)، کارســینۆمی ئادنۆســکواموس،[33] کارســینۆمی خانە بچووکەکان[34] (نزیکەی ٢٪ی بوارەکــان)، کــارســینۆمی خــانە پوولەکەدارەکــانی تێکەڵاو بە ســارکۆماتۆزەکان[35]، ســارکۆمەکان[36] و کارســینۆید[37] شــوێنی سەرهەڵدانی ئادنۆکارسینۆمی قوریژنک لە نزیکەی ٩٥٪ی بوارەکاندا بەشی خوارەوەی سورێنچکە، بەڵام شوێنی سەرهەڵدانی کارسینۆمی خانە پوولەکەدارەکان لە ١٥٪ی بوارەکاندا لە بەشــی ملی قوریژنک، ٥٠٪ لە بەشــی ناوەڕاســت و لە ٣٥٪ لە بەشــی خوارەوەی قوریژنکە. شــوێنی ســەرهەڵدانی کارسینۆمی قوریژنک لە بەشی ســەروو، ٥٠٪ نێوەڕاســت و ٣٠٪ بەشــی خوارووی ســورێنچکە. بە هۆی نەبوونی توێخی ســرۆزی لە بەشــی ســەرووی قوریژنکدا بڵاوبوونەوەی پێشــوەختی تومۆر لە پێکهاتە دراوســێیەکان و لە نێو ســابموکۆســدا، هەروەها تەشــەنەکردنی پێشــوەخت لە ڕێگەی لیمفەکانەوە دەبینرێ. تەشــەنەکردنی تومۆر لە ڕێگەی خوێنەوە لە چەشــنی وەدرەنگکەوتوو و زۆرتر بۆ نێو جگەر، ئێسک و سییەکانە.

[32] Adenoid cystic carcinoma

[33] Adenosquamous carcinoma

[34] Small cell carcinoma

[35] Shares squamous cell with sarcomatous

[36] Sarcomas

[37] Carcinoid



شێرپەنجەی قوڕیژنک لە چەشنی خانە پوولەکەدارەکان،
پێکگەیشتنی نائاسایی کۆی خانەکانی تومۆر

## پۆلبەندیی TNMی شێرپەنجەی قوڕیژنک

**T – تومۆری سەرەتایی**

**Tis**- کارسینۆم لە جێدا[٣٨]/ دیسپلازی بە پلەی سەرەوە[٣٩].

**T1**- بڵاوبوونەوەی[٤٠] تومۆر لە لامینا پرۆپریا[٤١] یان سابموکۆسدا[٤٢].

**T1a**- بڵاوبوونەوەی تومۆر لە لامینا پرۆپریا یان موسکولاریس موکۆسدا[٤٣].

**T1b**- بڵاوبوونەوەی تومۆر لە سابموکۆسدا.

**T2**- بڵاوبوونەوەی تومۆر لە موسکولاریس پرۆپریادا[٤٤].

**T3**- بڵاوبوونەوەی تومۆر لە ئادوێنتیتادا[٤٥].

**T4**- بڵاوبوونەوەی تومۆر لە نێو پێکهاتە دراوسێیەکاندا.

* **T4a** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە تەنیشتەسیی (پلورا)[٤٦]، پریکاردیوم[٤٧] یان ناوپەنچک (دیافراگم)[٤٨] یان پریتەنیۆمی دراوسێدا (پەردەی سک، چەقاڵتە).[٤٩]

* **T4b** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە ئەندامە دراوسێیەکانی دیکەدا، وەکو ئائۆرت، بڕبڕەکانی پشت یان قامیشەی ڕێگەی هەناسە.

---

[38] Carcinoma in situ
[39] High-grade dysplasia
[40] Infiltration
[41] Lamina propria
[42] Submucosa
[43] Muscularis mucosae
[44] Muscularis propria
[45] Adventitia
[46] Pleural cavity
[47] Pericardium
[48] Diaphragm
[49] Adjacent peritoneum

**N– لیمفەگرێ ناوچەییەکان**

**No**– نیشانەیەک لە مێتاستاز بۆ نێو لیمفەگرێ ناوچەییەکان نابینرێ.

**N1** سەرهەڵدانی مێتاستاز لە یەک هەتا دوو لیمفەگرێدا (بەستراوە بە شوێنی سەرهەڵدانەکەوە).

**N2** سەرهەڵدانی مێتاستاز لە سێ هەتا شەش لیمفەگرێدا.

**N3** سەرهەڵدانی مێتاستاز لە حەوت لیمفەگرێ و زۆرتر دەبینرێ.

**M– مێتاستازی دوور**

**M0** مێتاستاز نابینرێ.

**M1** سەرهەڵدانی مێتاستازی دوور (M1a و M1b بەستراوە بە جێگەی سەرهەڵدانەوە).[50]

---

[50] تومۆری بەشی سەرووی قوریژنکی نێو ڕکەی سینگ

- M1a(m) مێتاستازی لیمفەگرێکانی مل
- M1b مێتاستازەکانی دیکە

تومۆری بەشی خوارووی قوریژنکی نێو ڕکەی سینگ

- M1a(m) مێتاستاز لە زگەلیمفەگرێکان
- M1b مێتاستازەکانی دیکە

تومۆری بەشی نێوەڕاستی قوریژنکی نێو ڕکەی سینگ

- M1aM1b لێرە بەکار ناهێنرێ

مێتاستاز لە لیمفەگرێ ناناوچەیی یاخود مێتاستازەکانی دیکە

## قۆناخەکانی کارسینۆمی قوریژنک

| | |
|---|---|
| قۆناخی IA | T1/N0/M0 |
| قۆناخی IB | T2/N0/M0 |
| قۆناخی IIA | T3/N0/M0 |
| قۆناخی IIB | T1,T2/N1/M0 |
| قۆناخی IIIA | T4a/N0/M0<br>T3/N1/M0<br>T1,T2/N2/M0 |
| قۆناخی IIIB | T3/N2/M0 |
| قۆناخی IIIC | T4a/N1, N2, M0<br>T4b/ –ەکانNهەر کام له /M0<br>–یەکان Tهەر کام لەN3/M0/ |
| قۆناخی IV | –یەکان Tهەر کام له/ –ەکانNهەر کام له /M1 |

## نیشانەکان

بە داخەوە، نیشـــانەکانی کارســـینۆمی قوریژنک زۆر جار درەنگ دەردەکەون. ئەم نیشانانە بریتین لە:

* دژوارییی قووتـدانی پـاروو و خواردنەوە (پێویســـتە وێچوونی کارســـینۆمی قوریژنک لەوانەی کە لە تەمەنی ســـەرەوەی ٤٠ ســالّیدا تووشی دیسفاژی دەبن، ڕەت بکرێتەوە).

* دابەزینی قورسایی جەستە.

* خوێنڕێژی (خوێنبەربوون).

* زگئێشە یاخود ئێش لە پشت کوڵەکەی سینگدا.

* ئێشی ئێسک بە هۆی تەشەنەکردنی شێرپەنجەوە.

* کۆخەی بەردەوام.

* گڕبوونی دەنگ.[٥١]



سەرهەلدانی هاوکاتی شێرپەنجەی خانە پوولەکەدارەکان و زارکی گەدە

---

[51]Hoarseness

## دیاریکردن

* کۆکردنەوەی بەسەرهاتی نەخۆش (ئانامنێز) و نیشانەکان.

* ئەیزۆفاگۆگاستروٚدیۆدێنیسکۆپی[52] و نموونەهەڵگرتن لە سەرەتاییترین شێوە شیاوەکان بۆ دیاریکردنی شێرپەنجەی قورێژنک.

* بۆ دیاریکردنی پێشوەختی قۆناخی شێرپەنجە و تەشەنەکردنی بۆ پێکهاتە دراوسێیەکان، کەڵک لە کامپیۆتێرتۆمۆگرافیی سینگ و سک وەردەگیرێ.

* هەروەها کەڵک لە تومۆگرافی بە دەردانی پۆزیترۆنەوە[53] بۆ دیاریکردنی قۆناخی شێرپەنجە وەردەگیرێ.

* لە کاتی تەشەنەکردنی شێرپەنجەدا دەکرێ کەڵک لە ئێندسکۆپیک سۆنۆگرافی (ئێندۆسۆنۆگرافی)[54] بۆ دیاریکردنی قۆناخی T و Nی شێرپەنجە وەربگیرێ.

* بۆ ئاگاداری لە بڵاوبوونەوەی شێرپەنجە لە بۆری و بۆریچەکانی هەناسەدا کەڵک لە برۆنشسکۆپی[55] وەردەگیرێ.

* تۆراکۆسکۆپی[56] بۆ دیاریکردن و قۆناخبەندیی لیمفەگرێ ناوچەییەکان پێویست بە لاپراسکۆپی و تۆراکۆسکۆپییە.

* هەروەها لە ڕەوتی دەستنیشانکردنی شێرپەنجەدا دەکرێ کەڵک وەربگیرێ لە سۆنۆگرافیی سک، وێنەگرتنی سییەکان بە یارمەتیی تیشکی ئیکس لە دوو ڕەهەنددا، بەپێی پێداویستیی فلۆرۆسکۆپی[57]، دیاریکردنی قورێژنک بە کەڵکوەرگرتن لە مادەی ڕەنگی بەتوانایی

---

[52] Esophagogastroduodenoscopy
[53] Positron emission tomography (PET)
[54] Endoscopic ultrasonography
[55] Bronchoscopy
[56] Thoracoscopy
[57] Fluoroscopy

توانەوە لە ئـاودا[٥٨]، وێنـاکردنی زرنگـانەوەی موگنـاتیسـی[٥٩] و تاقیکردنەوەی فونکسیۆنی سییەکان[٦٠].

* کاتی سەرهەڵدانی نیشانە نورۆلۆژیکییەکان پێویست بە وێناکردنی زرنگانەوەی موگناتیسییە. فەلەجی گەڕاوەدەماری قورگ نیشانەی پەرەگرتوویی شێرپەنجەیە. لەوە دەچێ سەرهەڵدانی ئێش لە ئێسکەکاندا بە هۆی تەشەنەکردنی شێرپەنجەوە بێ، بەم پێیە، پێویست بە تاقیکردنەوەی کالسیۆم، ئالکالین فۆسفاتازی[٦١] خوێن، هەروەها سینتیگرافیی تەواوی جەستە، وێنەگرتنی ئێسک بە تیشکی ئێکس، هەروەها وێناکردنی زرنگانەوەی موگناتیسیی ئێسکەکانە.

## چارەسەر

هەڵبژاردنی شێوەی تراپیی شێرپەنجەی قوریژنک لە پێوەندی لەگەڵ دیاریکردنی قۆناخی ئەم نەخۆشییەدایە:

* لە قۆناخی یەکەم و بە تایبەتی لە T1aN0, Tisدا و هەروەها بۆ نەشتەرگەریی سەرەتایی لە T1b و هەر کام لە N-ەکاندا کەڵک لە ئێندسکۆپی (بۆ وێنە بۆ بڕین و لابردنی چینی موکۆسی[٦٢] یان دیسێکسیۆنی سابموکۆس[٦٣]) وەردەگیرێ.

* لە قۆناخی دوو و سێدا، پاش نەشتەرگەری کەڵک لە شیمۆڕادیۆتراپی[٦٤] وەردەگیرێ.

* لە قۆناخی چوارەمدا شیمۆتراپی یان شیمۆدەرمانیی نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە لەبەرچاو دەگیرێ.

---

58 Water-soluble contrast
59 Magnetic resonance imaging(MRI)
60 Pulmonary Function Testing (PFT)
61 Alcalic phosphatase
62 Mucosal resection
63 Submucosal dissection
64 Chemoradiation

## ئێندیکاسیۆن[٦٥] بۆ نەشتەرگەری

* دەستنیشانکردنی شێرپەنجەی قوریژنک لەوانەی کە بۆ نەشتەرگەری هەڵبژێرراون.
* دیسپلازی بە پلەی سەرەوە لەوانەی کە تووشی بارێت ئەیزۆڤاگیت بوون و دەرفەتی دەرمانی ئەوان لە ڕێگەی ئێندسکۆپییەوە نییە.

## کۆنترائیندیکاسیۆن[٦٦] بۆ نەشتەرگەری

* میتاستاز بە گرێکانی N2 (سیلیاک [سک]، سێرویکال [مل] و سوپراکلاویکولار [سەرووی چەڵەمەی سینگ]) یاخود ئەندامگەلی قەبارەدار[٦٧] وەکو جگەر و سییەکان.
* بڵاوبوونەوەی شێرپەنجە لە پێکهاتە دراوسێیەکان وەکو گەڕاوەدەماری قورگ، بۆری و بۆریچەکانی هەناسە، ئائۆرت و پریکاردیوم.
* کاتێک نەخۆش هاوکات تووشی نەخۆشییە مەترسیدارەکانی دڵ و ڕەگەکان، هەروەها هەناسەیی بێ.
* تێکچوونی کاری ئاسایی دڵ و سییەکان.

## چەشنەکانی نەشتەرگەری

* ئەیزۆفاگئەکتۆمی ترانس هیاتال.[٦٨]
* ئەیزۆفاگئەکتۆمی ترانس تۆراسیک.[٦٩]
* ئەیزۆفاگئەکتۆمی بە هێرشی کەمەوە.[٧٠]
* بڕین و لابردنی چینی موکۆسی قوریژنک لە ڕێگەی ئێندسکۆپییەوە.

## دەرمانی یاریدەدەری نوێ[٧١]

---

[65] Indications
[66] Contraindications
[67] Solid organs
[68] Transhiatal esophagectomy (THE)
[69] Transthoracic esophagectomy (TTE)
[70] Minimally invasive esophagectomy
[71] Neoadjuvant therapy

* هاوکات بەکارهێنانی ڕادیۆشیمۆدەرمانی.
* بۆ ماوەی ٤٥ ڕۆژ، نزیکەی ٤ حەوتوو دوای بڕین و جیاکردنەوەی قوریژنک لە ڕێگەی نەشتەرگەرییەوە.

## هەڵبژاردنی هەنگاوە سوکنایدەرەکان لەوانەی کە هەڵبژێرراوی نەشتەرگەری نین

* شیمۆدەرمانی.
* ڕادیۆدەرمانی.
* لایزەردەرمانی.
* دانانی فەنەر.[٧٢]

## ئامادەکاری بۆ نەشتەرگەری

بە گشتی، پێویستە پێش نەشتەرگەری هەرچەشنە کەمایەسییەکی نەخۆش قەرەبوو بکرێتەوە و بەپێی چۆنێتیی حاڵی نەخۆش، لە ڕێگەی دەمەوە بژێو بە نەخۆش بدرێ. بۆ ئەو کەسانەی کە تووشی کەمهێزیی قووتدان و لەدەستدانی نائاسایی قورسایی و هێزی لەش بوون، پێویستە خواردەمەنی لە چەشنی فرەکالۆری بێ. هەروەها دەکرێ خواردەمەنییەک (وەکو چێشتی کەشپێو[٧٣]) بە نەخۆش بدرێ کە بە هاسانی هەزم دەکرێ. لە تەنگبوونی سەختی قوریژنکدا لەوانەیە دابینکردنی فەنەری نێو قوریژنک[٧٤]، گاسترۆستۆمی ئیندسکۆپیک لە ڕێگەی پێستەوە[٧٥] و دابینکردنی بۆریی بژێوپێگەیاندن لە گەدەوە پێویست بێ، هەتا ڕۆژانە لانی کەم سێهەزار کیلۆکالۆری خواردەمەنی بە نەخۆش بدرێ. کاتێک وێچوونی پێوەند و جێگیرکردنی کەرتێک لە

---

[72] Stents
[73] Astronaut Food,Space food
[74] Stent implantation
[75] Percutaneous endoscopic gastrostomy

ڕیخۆڵەگەورە یان ڕیخۆڵەباریکە لە قوریژنکدا هەبێ، لاڤاژی ڕیخۆڵە[76] (شـــۆردن و خاڵی و خاوێنکردنەوەی ڕیخۆڵە) پێش نەشـــتەرگەری پێویســـتە. پێش هەرچەشـــنە نەشـــتەرگەرییەکی گەورە لە زگ و بە تایبەتی دوو بۆشـایی لەش (سـک و سـینگ) فێرکردنی هەناسـەدان[77] وەکو سپیرۆمیتری[78] پێشنیاز دەکرێ.

## بنەواشەکانی نەشتەرگەری لە ڕوانگەی ئۆنکۆلۆژیەوە[79]

بۆ نەشـــتەرگەریی ئادنۆکارســـینۆمی قوریژنک، پێویســـتە پۆلبەندیی سیوێرت (مونیخ)[80] لەبەرچاو بگیرێ. لە کارسینۆمی پێشوەختی بارێت کاتێک درێژایی سـیگمێنتی (کەرتی) بارێت لە ٤ سـانتیمەتر کەمتر بێ، ئاکامی نەشـتەرگەریی چاککەرەوە[81] و بڕین و لابردنی بەشـی دیستال و کـاردیالی (زارکی گەدە) قوریژنـک دەبێتە هۆی دابەزینی بەرچـاوی ڕادەی تراومای نەشـتەرگەری و نەخۆشی[82]، هەروەها بەرزکردنەوەی چۆنێتیی ژیان بە هۆی سـاغمانەوەی بەشـێکی زۆر لە قوریژنک. پاش لابردنی ئەو بەشـــانە، بۆ پێوەندیی قوریژنک و گەدە دەکرێ کەڵک لە ژێژیونوم[83] یـاخود کۆلۆن وەربگیرێ. بۆ بەرەوژووربردنی گەدە[84] پێویست بە جێبەجێکردنی هاوکاتی گەدە و دوازدەگرێ، هەروەها بڕین و جیـاکردنەوەی ڕەگەکـانی Vv. Gastricaebreves, a. Gastica sinstra, a. Gastroepiploica sinistra هەیە، بەڵام پـێـویســـــتە دەســـت لە A. Gastroepiploica dextra&Gasterica dextra نەدرێ. بۆ سازکردنەوەی بۆریی گەدە[85] دەکرێ بە یارمەتیی ســـتاپلێری نەشـــتەرگەری (دەزگای بڕین و

---

[76] Intestinal lavage
[77] Breathing training
[78] Spirometry
[79] Oncological
[80] Siewert classification
[81] Curative
[82] Morbidity
[83] Jejunum
[84] Gastric pull -up
[85] Stomach tube

دوورین)[86] کەڵک لە گەورەچەماوەی گەدە[87] وەربگیری، هەروەها بۆ واڵاکردنەوەی بەشی پیلور (بەرگەدە)[88] ئێکستراميكۆس پیلورۆمیۆتۆمی[89] یان پیلورۆپلاستی[90] پێویستە. لە کاتی سەرهەڵدانی میتاستازی لیمفەگرێکان برین و لابردنی تەواوی گەدە[91] بە شێوەی ترانس هیاتال و پاشان ئاناستامۆزی Y-Roux میدیاستینال[92] پێویستە.

## بنەواشەی[93] نەشتەرگەری لە شێرپەنجەی بەشی ملی قورێژنک

لەم حاڵەتەدا برین و لابردنی سێگمێنتێک[94] (یان ئەیزۆفاگۆئیکتۆمی تەواو[95]) لەگەڵ تیرۆیدئەکتۆمی[96] (ڕەنگ بێ لارینگئەکتۆمی[97]) و دیسێکسیۆنی مل[98]، هەروەها سازکردنەوەی[99] ڕێگەی قورێژنک[100] بۆ وێنە لە ڕێگەی پێوەندی (ئازادی) ڕیخۆڵەباریکە[101] پێویستە.

---

86 Surgical staples
87 Greater curvature of the stomach
88 Pylorus
89 Extra-mucosa pyloromyotomy
90 Pyloroplasty
91 Total radical gastrectomy
92 Mediastinal Y-Roux anastomose
93 Principe
94 Segmental resection (or segmentectomy)
95 Total esophagectomy
96 Thyroidectomy
97 Laryngectomy
98 Neck dissection
99 Reconstruction
100 Esophageal passage
101 Interponate(interposition)

## بنەواشەی نەشتەرگەری لە شێرپەنجەی بەشی سینگی قوریژنک لە ئاست و سەرەوەی شوێنی دوولقبوونی بۆریی هەناسە

بەبێ ئەملاولا تۆراکۆتۆمی[102] پێویستە. بۆ قایمکاری، مەودایەک بە درێژایی ١٠ سانتیمەتر لە تومۆرەوە بەرەودیستال و پرۆکسیمال لەبەرچاو دەگیرێ. بۆ ئەرخەیانبوون، لە سەرەتادا ئاناستۆمۆزی سێرویکال[103] ئەنجام دەدرێ. لە بەرەوژوورکشانی گەدە و لە کاتێکدا پێشتر گەدەی نەخۆشیان دەرهێنابێ، کەڵک لە پێوەندیی ڕیخۆڵەگەورە[104] بۆ سازکردنەوەی ڕێگەی قوریژنک وەردەگیرێ.

## بنەواشەی نەشتەرگەری لە شێرپەنجەی بەشی سینگی قوریژنک لە خوارەوەی شوێنی دوولقبوونی بۆریی هەناسە

بۆ ئەم مەبەستە بلانت ترانسمێدیاستینال ئابدۆمینال–سێرویکال ئەیزۆفاگۆئیکتۆمی[105] بێ تۆراکۆتۆمیی بەشی ڕاست یان ئابدۆمینال–تۆراکال، هەروەها بە وردی دیاریکردنی قۆناخی تەشەنەکردنی شێرپەنجە بۆ لیمفەگرێکانی مێدیاستینال[106] ئەنجام دەدرێ، هەروەها ڕێگەی قوریژنک لە ڕێگەی بەرەوژوورکشانی گەدە لەگەڵ ئاناستۆمۆزی سێرویکالەوە ساز دەکرێتەوە. بە گشتی، پێویستە هەمیشە شوێنی بەرەوژوورکشانی پێوەند (ئینتێرپۆنەیت) نەک لە جێگە پێشووەکەی قوریژنک، بەڵکو لە پشت کۆڵەکەی سینگدا (ڕەترۆستێرنال)[107] بێ!

---

102 Thoracotomy
103 Cervical anastomosis
104 Colonic interponate
105 Blunt transmediastinal abdominal - cervical esophagectomy
106 Mediastinal lymph node staging
107 Retrosternal

## ئاڵۆزییەکانی نەشتەرگەری

* ناتەواویی ئاناستۆمۆز.[108]
* تەنگبوونەوەی ئاناستۆمۆز.
* نێکرۆزیی بەشی چێنراو.
* نێکرۆزیی بۆریی سەرلەنوێ سازکراوەی گەدە.
* فەلەجی گەڕاوەدەماری قورگ.
* فیستولی لەنفاوی.[109]
* پانکراتیت (هەوی شپیلک).
* پنومۆتۆراکس.
* خوێنبەربوون لە کات یان پاش نەشتەرگەری.
* چڵکی جێبرین.
* ئاسپیراسیۆن پنومۆنی.
* نەخۆشیی درێژخایەنی گیرانی سییەکان[110].

## شیمۆدەرمانی یاریدەدەر[111] لەگەڵ یان بەبێ ڕادیۆتراپی

ڕادیۆشیمۆدەرمانی پاش نەشتەرگەری دەبێتە هۆی دابەزینی ڕادەی سەرهەڵدانەوەی تومۆر لەو شوێنەی کە ڕێزەکسیۆنی R1ی لێ کراوە.

بۆ دەرمانی ئەو تومۆرانەی کە بۆ نەشتەرگەری نابن، دەکرێ کەڵک لە نەخشەی **FLP** وەربگیرێ:

- 5-FU: 2/g m2؛ Folinic acid (Leucovorin)(FA): 500mg /m2, cisplatin 50 mg/m2

---

108 Anastomotic insufficiency
109 Lymphatic fistula
110 Chronic obstructive pulmonary disease (COPD)
111 Aduvant Therapy

## ڕادیۆتراپی:

- Cisplatin 50mg/m2 D 1 & D 8., Etoposid 80 mg/m2 d 3,4,5 radiation therapy 2 -2,5 GY/d 5 day/Week total dose 30-50 GYin the reference point.

## نەخشەی PLF لە شیمۆدەرمانی پێش نەشتەرگەری

- Cisplatin50mg/m2,1houri.v.-Inf.Week1,3,5, _ Folinic acid(Leucovorin)500mg/m2 , 2 hour i. v. Inf. Week 1,2,3,4,5,6, 5 FU 2000mg / m2 24 hour i.v. inf, week 1,2,3,4,5,6,
- repeat day 50 ,Application of two and a half cycles until day 15 of the third cycle. Operation in the week 21 or 22.

## نەخشە باوەکانی دیکە بریتین لە:

- FOLFOX (Folinic acid, Fluorouracil as bolus, Oxaliplatin
- FOLFIRI (Folinic acid, Irinotecan, Fluorouracil )
- TEC (Docetaxel, Adriamycin, Cyclophosphamid)

## شیمۆدەرمانیی یاریدەدەری نوێ[112]

لە کاتی پەرەگرتنی تومۆر لە شـــوێنێک[113] یاخود تومۆرێک کە لە ســـەرەتادا وێچوون و بارودۆخی پێویســـت بۆ نەشـــتەرگەریی ئەو نەبووە[114]، بەکارهێنانی شـــیمۆدەرمانیی یاریدەدەری نوێ لە ٤٠٪ی بوارەکاندا دەرفەتی پێویست بۆ ڕێزەکسیۆنی ناسـەرەکی R0[115] پێک دێنێ. کەڵکوەرگرتن لە کۆی Eposit, Adramycin, Cisplatin (نەخشـــەی EAP) یان Epirubicin, Cisplatin , 5 Fluorouraci (نەخشـــەی CFC) کاریگەریی لەســـەر ٦٠٪ هەتا ٨٠٪ی نەخۆشـــەکان هەیە و لە ٤٠٪ی ئەواندا دەبێتە هۆی زیندوومانەوەیان بۆ ماوەی ٣ساڵ.

---

112 Neoaduvant Chemotherapy
113 Locally advanced
114 Inoperable tumor
115 A secondary Ro resection

## شیمۆدەرمانیی ئازارشکێن (سوکناییدەر)[116]

لە کارسینۆمی تەشەنەکردووی قوڕیژنکدا دەکرێ کەڵک لە دەواگەلێکی وەکـــو Cisplatin / 5-FU, Vepesid, Vinorelbine, Taxane بـــۆ شیمۆدەرمانیی سوکناییدەر وەربگیرێ.

## تیشکدەرمانی

لە تیشـــــکدەرمـانی نێو قوڕیژنکیـدا، بەپێی کەڵکوەرگرتن لە تەکنیکی براکیتراپی یان نزیک دەرمـانی[117]، نەخۆش کەمتر تووشـــــی ئازار و ســــترێس دەبێ، هەروەهـا لە زۆربەی بوارەکـانـدا لە مـاوەیەکی زۆر کەمـدا کۆتـایی بە دژواریی قووتچوونی دێ. کـاتێـک دەرەتـانی نەشتەرگەری نەبێ، دەکرێ بۆ دەرمانی کارسینۆمی خانە پوولەکەدارە تەشـەنەنەکردووەکانی قوڕیژنک، بە باشـی کەڵک لە ڕادیۆشـیمۆتراپی وەربگیرێ. دۆزی ڕادیۆشـــیمۆتراپی پێش نەشـــــتەرگەری هەتـا ٤٠ گرێی[118] و کاتێک بە هەر هۆیەک دەرەتانی نەشـــــتەرگەری نەبێ، ئەم دۆزە هەتا نزیکەی ٦٥ گرێیە.

## شوێنگرتن[119]

لە کـاتی ســـــەرهەڵـدانەوەی تومۆردا، بە گشـــتی چیتر دەرەتـانی چـاککردنەوەی نەخۆش نـامێنێ و شـــوێنگرتن لە چوارچێوەی هەنگاوگەلێک بۆ هێدیکردنەوەی نیشـــانەکانی نەخۆشـــی قەتیس دەمێنێتەوە. پێویستە نەخۆش بەردەوام لەژێر چاودێریی پزیشکدا بێت و لە ڕێگەی ئەیزۆفاگۆسکۆپییەوە کۆنترۆڵ بکرێ.

---

116 Palliative
117 Brachytherapy
118 Gray
119 Follow up

## دوابینی (پێشبینی)[120]

ماوەی زیندوومانەوەی نەخۆش لە پێوەندی لەگەڵ قۆناخی نەخۆشی و پەرەسەندن و تەشەنەکردنی شێرپەنجەدایە. مامناوەندیی ژیانی ئەوانەی تووشی مێتاستازی لیمفەگرێکان یان ئەندامگەلێکی وەکو جگەر و سییەکان بوون، لە ئاستێکی نزمدایە، بەڵام پرۆگنۆز لەوانەدا کە تووشی مێتاستازی لیمفەگرێکان و ئەندامەکانی دیکە نەبوون، بە ڕادەیەکی بەرچاو باشترە و ڕادەی زیندوومانەوەیان تا پێنج ساڵە. لە قۆناخی چوارەمدا ماوەی زیندوومانەوە بۆ ٥ ساڵ لە ٥٪ کەمترە. (بڕوانە نەخشەی خوارێ).

**نەخشەی مامناوەندیی زیندوومانەوەی نەخۆش بۆ ماوەی ٥ ساڵ بەپێی قۆناخی تی ئێن ئێم**

| قۆناخبەندیی تی ئێن ئێم | زیندوومانەوە بۆ ٥ ساڵ (٪) |
|---|---|
| 0 | ١٠٠ |
| I | ٨٠ |
| IA | ٤٠ |
| IIB | ٣٠ |
| III | ١٥ |
| IV | 0 |

---

120 Prognosis

# سەرچاوەکان

1- Keith M Baldwin, DO, IMPH; Chief Editor: Jules E Harris, MD ... Esophageal Cancer. Updated: Oct 17, 2014 http://emedicine.medscape.com/article/277930-overview

2- Terence D Rhodes, MD, PhD; Chief Editor: Jules E Harris, MD ... Esophageal Cancer Staging. Updated: Sep 6, 2013, http://emedicine.medscape.com/article/2003224-overview

3- Robert J. Mayer, Esophagal Cancer, Harrison's Principales of Internal Medicine, 17th Edition, Volume I, 2008,

4- Roy C. Orlando. Esophagal Cancer, Cecil Medicine 23rd edition 2008

5- Anil K. Rustgi, Cancer of Esophagus. Cancer, Principels&Practice of Oncology 8Th Edition, Lippincott Williams& Wilkins

6- .M. Stahl, H.-J. Mayer Ösophaguskarzionm, , Die Onkologie 2.Auflage, Springer, 2010

7- Bosset JF, Gignouy M, Triboulet JP, Tiret E, Mantion G, Elias D,Lozach P, Ollier JC, Mercier M, Sahmound T, (1997)Chemoradotherapy followed by surgery compared with surgery alone n squamous –cell cancer of the esophagus. N Engl J Med 337(3): 161-167

8- Burmeister BH, Smithers BM, Gebski V, Fitzgerald L, Simes RJ, dewitt P, Ackland s, Gutley DC, Joseph D, Millar J, North J, Walpole ET, Denham JW, (2005) surgery alone versus Chemotherapy followed by surgery for resectable cancer of the esophagus : a randomized controlled phase 111 trial. Lancet Onco 6: 659-668

9- .Fujita H, kakegawa T, yamana H, Sueyoshi S, Hikita S, Mine T, Tanaka Y, Ishikawa H, Shirouzu K, Mori K, Inoue Y, Tanabe HY, Kiyokawa K, Tai Y, Inutsuka H, (1999) tota esophagektomy versus oroximal esophagektomy for esophageal cancer at the cervicothoracic junction.World J Surg 23:486-491

10- Medical Research Council Esophageal Cancer working party (2002) surgical resection with or without preoperative Chemotherapy in Esophageal cancer: a randomized controlled trial Lancet 359: 1727-1733

11- Mooney MM (2005) Neoadjuvant and adjuvant chemotherapy for esophageal adenocarcinoma.J Surg Oncol 92: 230-238

12- Nguyen NT, Gelfand T, Stevens CM, chalifoux S, chang K, Nguyan P, Luketich JD (2004) Current status of minimally invasive esophagektomy. Minerva Chr 59: 437-446

13- Schneider B, Bigenzahn W, End A, Denk DM, Klepetko W, (2003) External vocal fold medialisation in patiens with recurrent nerve

paralysis following cardiothoracic surgery. eur J cardiothorac surg 23: 477-483
14- Shatavi H, Ostermann G, (1989) Kompendium der Onkologischen Chirurgie :7-12
15- Siewert JR, Feith M, stein HJ (2005) Biologic and clincal variatiions of adenocarcinoma at the esophago-gastric junktion : relevanse oft a topographic - anatomic subclasifcation. J Surg Oncol 90: 139-146
16- Stein HJ, Brücher BLDM,Sendler A, Siewert JR (2001) Esophageal cancer : patient evaluation and pre-treatment staging. Surg Oncol 10: 103-111
17- Von Dossow V, Welte M, Zaune U, Martin E, Walter M, Ruckert J, Kox WJ, Spies CD,(2001) Thorasic epidural anesthesia combined wth general anesthesia : the preferred anesthetic technique for thoracic surgery. Anesth Analg 92: 848-854
18- von Rahden BH, Stein HJ, (2005) staging and treatment of advanced esophageal canser. Curr Opin Gastroenterol 21: 472-477
19- Zacherl J, Jakesz R (2000) Stand de r chirurgischen Studien in der Onkologie. Chirurg 71: 646-657
20- www.aco-asso.at Austrian society of surgical oncology
21- www.ssat.com Society for surgery of the alimentary Tract (SSAT)
22- www.asco.org/ac/1,1003,_12-002138,00.asp American society of Clinical Oncology (ASCO)
23- www.cancercare.on.ca/pdf/pebc2-11f.pdf Cancer Care Ontario Program
24- www.cancer.gov/cancer_topics/types/esophageal/ US national Cancer Institute.

# بەشی دووەم

## شێرپەنجەی گەدە[121]

## پەتاناسی

بەپێی زانیارییە تۆمارکراوە جیهانییەکان - ٢٠٠٨[122]، پاش شێرپەنجەی سییەکان، مەمک و کۆڵۆن و ڕەکتۆم، شێرپەنجەی گەدە لە شوێنی چوارەمدایە (٩٨٩٠٠٠ کەس لە ساڵدا)، بەڵام دووەمین هۆی مردنە بە هۆی شێرپەنجەوە (٧٣٨٠٠٠ کەس لە ساڵدا). شوێنی پتر لە ٧٠٪ی شێرپەنجەی تازەدیاریکراوی گەدە لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و بە تایبەتی لە چینە. بە گشتی، ڕێژەی سەرهەڵدانی ئەم شێرپەنجەیە لە ئاسیا و بەشێک لە باشووری ئەمەریکا لە سەرەوەیە و لە باکووری ئەمەریکا لە ئاستێکی نزمدایە. زۆرترین ڕادەی مردن لە شیلی، ژاپۆن، باشووری ئەمەریکا و یەکیەتیی سۆڤیەتی پێشوو تۆمار کراوە. ڕادەی سەرهەڵدانی شێرپەنجەی گەدە لە پیاواندا نزیکەی دوو قات بەرزترە لە ژنان. ئادنۆکارسینۆم باوترین چەشنی هیستۆلۆژیکی شێرپەنجەی

---

121 Gastric cancer

122 2008 global registry data

گەدەیە (لە ٨٥٪ تا ٩٠٪). لە ٣٥٪ی بوارەکاندا شوێنی سەرهەڵدانی لە بەشی ئانترۆم – پیلوری گەدە، ٣٠٪ بەشی بچووکەچەماوەی[١٢٣] گەدە، لە ٢٥٪ لە کاردیا (دەمی گەدە) و ١٠٪ لە شوێنەکانی دیکەی گەدەدایە.

## هۆ و فاکتەرە مەترسیدارەکان

لە گشت جیهاندا هلیکۆباکترپیلوری[١٢٤] بەرچاوترین و باوترین فاکتەری مەترسیدارە بۆ شێرپەنجەی گەدە. هەرچەند وا بەراورد دەکرێ لە ٥٠٪ی خەڵک تووشی هلیکۆباکترپیلوری بن، بەڵام تەنها لە بەشێک لەم کەسانەدا شێرپەنجەی گەدە سەرهەڵدەدا. فاکتەرە پڕمەترسییەکانی دیکە بریتین لە: فاکتەرەکانی ژنێتیک (بۆ وێنە موتاسیۆنی ژێنی E-Cadherin و سیندرۆمی لینچ[١٢٥] یاخود شێرپەنجەی ناپۆلیپۆزی کۆلۆرەکتاڵ[١٢٦] کە حاڵەتێکی ژنێتیکیی ئۆتوزومالی زاڵە[١٢٧])، فاکتەری ژینگە، تیشکی یۆندار[١٢٨]، چێشتی زۆر سوێرکراو[١٢٩] یان بە دووکەڵ ئامادەکراو[١٣٠]، هەوی ئاترۆفیکی ئاوتۆئیمەنی گەدە[١٣١]، هەروەها سەرهەڵدانی شێرپەنجە ١٥ هەتا ٢٠ ساڵ پاش ڕێزەکسیۆنی بەشێک لە گەدە. لەوە دەچێ خواردنی چێشتی مێدیترانەیی[١٣٢] وەکو میوە، پیواز و سەوزی، هەروەها ڤیتامین C ڕۆڵی بەرگریکردنیان بێ. پەرنیسیۆز ئانیمی[١٣٣] و ئادینۆمی گەدە[١٣٤]، هەروەها نەخۆشیی مەنیتریر[١٣٥] ڕێخۆشکەری شێرپەنجەی گەدەن.

---

123 Curvatura gastrica minor
124 H. Pylori
125 Lynch syndrome
126 Hereditary nonpolyposis colorectal cancer
127 <u>**Autosomal dominant**</u>
128 Ionizing radiation
129 Heavily salted foods
130 Smoked
131 Chronic autoimmune atrophic gastritis
132 Mediterranean diet
133 Pernicious anemia
134 Gastric adenoma
135 Menetrier's disease

## قەوارە و کاری گەدە

گەدە ئەندامێکی نێوخاڵییە لە بەشی سەرووی چاڵی زگ و لە شوێنی بەیەکگەیشتنی گەدە – قوڕیژنەکەوە دەست پێ دەکات و لە پیلور[١٣٦]دا (واتە بەرگەدە) کۆتایی پێ دێ. گەدە بۆ چوار بەش دابەش دەکرێ:

* **کاردیا**[١٣٧] (زارک یان دەمی گەدە): بەشی سەرووی گەدەیە، ئەم بەشە لە شوێنی لکانی قوڕیژنک بە گەدە هەتا فوندوسە[١٣٨] و زۆربەی زۆری خانەکانی دەڵاندنی موسین[١٣٩] لە خۆ دەگرێ.

* **فوندوس** (بنی گەدە): بەشی نێوەڕاست یان گەورەترین بەشی گەدەیە. ئەم بەشە خانەکانی موکۆید، خانەکانی پێپتید[١٤٠] و دیواری (پاریتال)[١٤١] لە خۆ دەگرێ.

* **کۆرپوس** یان تەن (جەستە)[١٤٢].

* **پیلور** (بەرگەدە) یاخود کاناڵی پیلوریک، بەشی خواروویی گەدە پێک دەهێنێ و لە چەشنی لوولەیەکە کە گەدە بە دوازدەگرێوە پێوەند دەدا. پیلور پێکهاتەیەکە لە خانەکانی بەرهەمهێنەری موکۆس (لینجە) و ئیندۆکرین[١٤٣].

**لە گەدەدا دوو تەسکی هەیە:**

* **تەسکیی خوارووی قوڕیژنک** لە نێوان گەدە و قوڕیژنکدا پێشگیری لە گەڕانەوەی مادەی خوراو لە گەدەوە بۆ نێو قوڕیژنک دەکا.

* **تەسکیی پیلور**[١٤٤] لە کۆتایی گەدەدا ڕۆڵێکی بەرچاو لە ساوین و وردکردنی مادەگەلی قەبارەداری خوراو لە نێو گەدە و پێشگیری لە گەڕانەوەی مادەگەلی نێو دوازدەگرێ بۆ گەدە دەکا.

---

136 Pylorus
137 Cardia
138 Fundus
139 Mucin-secreting cells
140 Peptic cells
141 Arietal cells.
142 The body (corpus)
143 Mucus-producing cells and endocrine cells
144 Pyloric sphincte

**دیواری گەدە لە پێنج چین پێک هاتووە:**

* **موکۆس**[145] یان داپۆشـــەری ژوورەکیی گەدە، ٣ چینی ئیپیتەلیوم[146]، لامینا پرۆپریا و موسکولاریس موکۆس لە خۆ دەگرێ.

* **ســـابموکۆس:** پێکهێنەری تۆرێک (تەنراوێک)[147] لە تـان و پۆی هاوبەستە و لیمفۆسیتەکان، پلاسماسێلەکان، ئارتریۆلەکان، ونۆلەکان و لیمفاتیکەکان لە خۆ دەگرێ.




* **چینی ماسـوولکەیی**[148]: (موسـکولاریس پرۆپریا) کە خۆی بریتییە لە چینە مـاســـوولکەییە ســـافەکان لە حاڵەتەکانی ژوورەکیی لار[149]، نێوەڕاستی بازنەیی[150] و درێژەدەرەکی[151].

---

145 Mucosa,
146 Epithelium
147 Network
148 Muscularis layer
149 Inner oblique
150 Middle circular
151 Outer longitudinal

* **سابسرۆز**[152].

* **چینی سرۆزی**[153]: دواچینی دیوارەی گەدەیە.

بەشـی ڕاسـتی ڕووپەری پێشـەوەی گەدە هاوسنووری لۆبی (پەڕەی) چەپی جگەر (سـیگمێنتەکان[154]ی II, III, IV) و دیواری پێشـەوەی سـکە. بەشـی چەپی گەدە هاوسـنووری سـپڵ و ڕژێنی ئادیرنالی چەپ[155] و بەشـی سـەرووی گورچیلەی چەپ، بەشـی ڤێنترالی (سکی، ناوەکی)[156] پەنکریاس (شـپیلک) و بەشـی ئاسـۆیی کۆلۆنە[157]. شـوێنی شـێرپەنجەی گەدە لەسـەر بنـاغەی پێوەندیی ئەو لەگەڵ درێژەتەوەرەی[158] گەدە پلەبەندی دەکرێ. نزیکەی ٤٠٪ی شێرپەنجەی گەدە لە بەشـی خوارووە، ٤٠٪ لە بەشـی نێوەڕاست و ١٥٪ی لە بەشی سـەروو سـەرهەڵدەدا، هەروەها ١٠٪ لە شـوێنی سـەرهەڵدانی شێرپەنجەی گەدە زۆرتر لە تەنها بەشێکی ئەم ئەندامەدایە.

## کاری سەرەکیی گەدە

* پاشـەکەوتکردنی چێشـتی خوراو لە بەشـی پروکسـیمالی گەدە، واتە فوندوس و لە سێیەکی سەرەتایی کۆرپوسی گەدە.

* سـاوین، وردکردن، تێکەڵاوکردن و یەکسـانکردنی چێشتی خوراو لە بەشی دیستالی گەدە.

خـاڵیکردنی چێشـتی تێکەڵکراوی قەبـارەدار و ئـاوەکی بە هۆی هـاوئـاهەنگیی کـاری نـاوچە جۆراوجۆرەکـانی گەدەیـە لەگەڵ فیـدبەکی ڕیخۆڵەباریکە. شلەمەنی بە خێراییەکی زۆر بەتاڵ دەکرێ، بەڵام بەشی قەبارەداری چێشـت بە هۆی گرژبوونی گەدە بەرەوپێش و ئانترۆم[159]

---

[152] Subserosal layer
[153] Serosal layer
[154] Segments
[155] Left adrenal gland
[156] Ventral portion
[157] Transverse colon
[158] Long axis
[159] Antrum

ڕەوانە دەکرێ، تا پێش دەرهاویشتنی لە ڕێگەی پیلورەوە ئەندازەکەی دەگاتە یەک هەتا دوو میلیمەتر.



هیستولۆژیی کارسینۆمی خانەکانی ئەموستیلە موری گەدە

## پاتۆلۆژی

مەبەست لە شێرپەنجەی گەدە هەر چەشنە شێرپەنجەیەکە کە لە نێوان شوێنی بەیەکگەیشتنی قورێژنک و گەدە هەتا پیلور سەرهەڵدەدا. نزیکەی ٩٥٪ی تومۆرەکانی گەدە لە خانەکانی ئیپیتەلیالەوە سەرچاوە دەگرن و وەکو ئادنۆکارسینۆم و کارسینۆمی خانەکانی ئەموستیلە (ئەنگوستیلە)ی مۆر[١٦٠] پێناسە دەکەن. چەشنەکانی دیکەی تومۆری گەدە کە بە دەگمەن سەرهەڵدەدەن، بریتین لە: ئادنۆسکواموس، سکواموس و کارسینۆمی جیانەکراوە. **پۆلبەندیی "سیوێرتی"** کارسینۆمی گەدە بەپێی شوێنی سەرهەڵدانی شێرپەنجە بەم چەشنەیە:

* **سیوێرتی I**: یەک هەتا پێنج سانتیمەتر سەرەوەی هێڵی Z (لە قورێژنکەوە بەرەو شوێنی بەیەکگەیشتنی قورێژنک و گەدە).
* **سیوێرتی II**: یەک سانتیمەتر سەرەوە و دوو سانتیمەتر ژێرەوەی هێڵی Z
* **سیوێرتی III**: دوو هەتا سێ سانتیمەتر ژێرەوەی هێڵی Z.

ئانترۆپیلور باوترین شوێنی سەرهەڵدانی شێرپەنجەی گەدەیە. کارسینۆمی کۆرپوس زۆرتر لە درێژایی گەورە یاخود بچووکەچەماوەی گەدەدا سەرهەڵدەدات. زۆر جار تومۆری بەشی

---

[160] Signet ring cell carcinoma

کاردیا لە تومۆری شـــوێنی بەیەککگەیشـــتنی قوریژنک و گەدە جیا ناکرێتەوە.

**ڕێکخراوەی بێهداشتی جیهانی و سیستەمی پۆلبەندیی لاورێن**[161] لە ڕوانگەی هیستۆلۆژیکەوە شێرپەنجەی گەدە ئاوا ڕیزبەندی دەکەن:

* **چەشنی ڕیخۆڵەیی**[162]. خانەکانی ئەم چەشنە تومۆرە بە باشی جیا دەکرێنەوە، پەرەگرتنی بە ئارامییە و مەیلی بۆ پێکهێنانی گلاند (ڕژێن) هەیە. ڕادەی سـەرهەڵدانی لە پیراندا پترە تا لاوان، هەروەها لە پیاواندا بە بەراورد لەگەڵ ژنان زۆرترە.

* **چەشـــنی پەرەگرتوو یان بڵاوبووەوە**[163]. خانەکانی ئەم چەشـــنە تومۆرە بە بـاشـــی جیـا نـاکرێنەوە، پەرەگرتنی بە خێرایی و هێرشـــبەرانەیە و مەیلی زۆرتر بۆ بڵاوبوونەوە لە نێو گەدەدا هەیە (زۆرتر لەوەی کە مەیلی بۆ پێکهێنـانی ڕژێن بێ) و بە پێچەوانەی چەشـنی ڕیخۆڵەیی، تەشـەنەکردنی لە شـوێنەکانی دیکەی لەش خێراتر و ڕادەی ســـەرهەڵدانی لە پیاو و ژندا یەکســـانە، هەروەها زۆرتر لە گەنجەکاندا سەرهەڵدەدا.

* **چەشـنی تێکەڵاو**[164]. تایبەتمەندییەکانی هەر دوو چەشـنی ڕیخۆڵەیی و بڵاوبووەوە لە خۆ دەگری.

---

161 Lauren classification
162 Intestinal type
163 Diffuse type
164 Mixed type



چەشنی ڕیخۆڵەیی ئادنۆکارسینۆمی گەدە، لەگەڵ توپەڵی ڕژێنە نائاساییەکان

**پۆلبەندیی ماکرۆسکۆپیکیی شێرپەنجەی گەدە:**




* **چەشنی یەک (تۆپەڵ، قەبارە[165])**. تومۆری پۆلیپۆید[166]، بە تەواوی و ڕوونی لە موکۆسی دەوروبەری جیا دەکرێتەوە.

* **چەشنی دوو (ئولسراتیڤ[167])**. تومۆری زامدار بە سنوورێکی پەرەگرتووە. دەوری ئەم تومۆرە لە لایەن دیواری ئەستووری گەدە کە سنوورەکەی بە ڕوونی جیا دەکرێتەوە، گیراوە.

* **چەشنی سێ (ئینفلتراتیڤ ئولسراتیڤ[168])**. تومۆری زامدار بە سنوورێکی پەرەگرتووە. دەوری ئەم تومۆرە لە لایەن دیواری ئەستووری گەدەوە کە سنوورەکەی بە ڕوونی جیا ناکرێتەوە، گیراوە.

* **چەشنی چوار (دیفوز ئینفیلتراتیڤ[169])**. بڵاوبوونەوەی بەربڵاوی تومۆر لە دیواری گەدە. زۆر جار تومۆر لەم قۆناخەدا بێزامە.

---

165 Mass
166 Polypoid tumors
167 Ulcerative
168 Infiltrative ulcerative
169 Diffuse infiltrative

## تەشەنەکردنی تومۆر

تەشەنەکردنی تومۆر لە ڕێگەی لیمف و لیمفەڕەگەکانەوە:

* لە ڕێگەی تەواوی لیمفەگرێکانی جێگیر لە بچووکە و گەورەچەماوەی گەدە.

* لە ڕێگەی لیمفەگرێکانی ناوچەی پەیکەری بۆشایی سک (هەتا خوێنبەری جگەر و ناوکی سپڵ).

* لە ڕێگەی لیمفەگرێکانی پاراشاورتیک و مێزەنتەریک (ڕیخۆڵەبەند).

لە ٧٠٪ی نەخۆشەکاندا لە کاتی دیاریکردنی شێرپەنجەدا مێتاستازی لیمفەگرێکان دەبینرێ، ئەم ڕادەیە لە قۆناخی T1b ٣٪ و لە قۆناخی T1b ٣٠٪یە. تومۆر لە ڕێگەی خوێن و خوێنبەرەکانەوە بۆ جگەر، سییەکان، ئێسک و مێشک تەشەنە دەکا.

### پۆلبەندیی TNMی شێرپەنجەی گەدە

**T – تومۆری سەرەتایی**

**TX** تومۆری سەرەتایی بۆ هەڵسەنگاندن نابێ.

**T0** تومۆری سەرەتایی دیاری ناکرێ.



کامپیوتیرتوموگرافیی: تەشەنەی شێرپەنجەی گەدە بۆ مێشک پاش سیتوستاتیکترایی

**Tis** کارسینۆم لە جێدا/ تومۆری نێوئیپیتەلیاڵ بەبێ هێرشبردنەسەر لامینا پرۆپریا.

**T1** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە لامینا پرۆپریا یان سابموکۆس یان موسکولاریس موکۆسدا.

**T1a** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە لامینا پرۆپریا یان موسکولاریس موکۆسدا.

**T1b** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە سابموکۆسدا.

**T2** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە موسکولاریس موکۆسدا.

**T3** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە تان و پۆی هاوبەستی سابسرۆز[١٧٠] بەبێ هێرشبردنەسەر پریتەنیۆمی ڤیسراڵ[١٧١] یاخود پێکهاتە دراوسێیەکان.

**T4** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە سرۆز یان نێو پێکهاتە دراوسێیەکاندا.

* **T4a** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە نێو سرۆز یان پریتەنیۆمی ڤیسراڵدا.
* **T4b** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە پێکهاتە دراوسێیەکاندا.

## N – لیمفەگرێ ناوچەییەکان

**NX** لیمفەگرێ ناوچەییەکان بۆ هەڵسەنگاندن نابن.

**No** نیشانەیەک لە مێتاستازی لیمفەگرێ ناوچەییەکان نابینرێ.

**N1** سەرهەڵدانی مێتاستاز لە یەک هەتا دوو لیمفەگرێدا.

**N2** سەرهەڵدانی مێتاستاز لە سێ هەتا شەش لیمفەگرێدا.

**N3** مێتاستاز لە حەوت و پتر لە حەوت لیمفەگرێدا دەبینرێ.

**N3a** مێتاستاز لە حەوت هەتا پازدە لیمفەگرێدا دەبینرێ.

**N3b** مێتاستاز لە شازدە و پتر لە شازدە لیمفەگرێدا دەبینرێ.

## M –مێتاستازی دوور

**M0** مێتاستاز نابینرێ.

**M1** سەرهەڵدانی مێتاستازی دوور

---

[170] Subserosal

[171] Visceral peritoneum

## قۆناخەکانی کارسینۆمی گەدە

| | |
|---|---|
| 0 | Tis/N0/M0 |
| قۆناخی IA | T1/N0/M0 |
| قۆناخی IB | T2/N0/M0<br>T1/N1/M0 |
| قۆناخی IIA | T3/N0/M0<br>T2/N1/M0<br>T1/N2/M0 |
| قۆناخی IIB | T4a/N0/M0<br>T3/N1/M0<br>T2/N2/M0<br>T1/N3/M0 |
| قۆناخی IIIA | T4b/N1/M0<br>T4b/N1/M0<br>T4a/N2/M0<br>T3/N3/M0 |
| قۆناخی IIIB | T4b/N0/M0<br>T4b/N1/M0<br>T4a/N2/M0<br>T3/N3/M0 |
| قۆناخی IIIC | T4b/ N2, M0<br>T4b/N3/M0<br>T4a/N3/M0 |
| قۆناخی IV | M1/هەر کام لە Nـەکان/ هەر کام لە T-یەکان |

## نیشانەکان

لە قۆناخی سەرەتایی شێرپەنجەی گەدەدا زۆر جار نیشانەیەک نابینرێ یان لەوە دەچێ نیشانەگەلێکی ناتایبەتمەند، وەکو دڵتێکهەڵاتن، هەرسنەکردنی چێشتی خوراو و ئێشێکی ناڕوونی گەدە ببینرێ. بەپێی پەرەسەندنی شێرپەنجە، ئەم نیشانانەی خوارەوە بەرچاو دەکەون:

* ئێشی گەدە و باکردنی سک.
* دابەزینی قورسایی لەش (مامناوەندیی زیندوومانەوەی ئەوانەی کە پتر لە ٥ کیلۆ کێشی جەستەیان دابەزیوە، لە ئاستێکی نزمدایە).
* دژواریی قووتدانی پاروو و خواردنەوە.
* هەستکردن بە پڕبوونی گەدە.
* بێئیشتیایی.
* ڕشانەوەی خوێن.
* کۆخەی خوێناوی.
* ڕەشبوونی پیسایی بە هۆی خوێنبەربوونەوە.
* دیاریکردنی تۆپەڵێکی نائاسایی لە کاتی پشکنین یان گەورەبوونی گەدەدا.
* گەورەبوونی لیمفەگرێکان وەکو گرێکانی ویرشۆڤ[172] و ئێرلەندی[173].



گرێی ئێرلەندیی



گرێی ویرشۆڤ

---

[172] Virchow nodes
[173] Irish node

## ئاڵۆزییە پێشوەختەکان

* کۆبوونەوەی تراو یاخود چڵک لە پەردەی سک و تەنیشتەپەردەدا[١٧٤].

* گیران یان بەستـرانی جێی چوونەدەرەوەی[١٧٥] گەدە، شـوێنی بەیەککەیشتنی قوریژنک و گەدە، هەروەها ڕیخۆڵەباریکە.

* پاش نەشـتەرگەریی خوێنبەربوونی واریسـی قوریژنک یـان ئاناستۆمۆز[١٧٦] بۆ نێو گەدە.

* زەردوویی نێوجگەری[١٧٧] بە هۆی گەورەبوونی جگەر.

* زەردوویی دەرەوەی جگەری[١٧٨].

* لاوازی[١٧٩] بە هۆی برسـیتی[١٨٠] یان کاشـیکسـی[١٨١] (کزی و لاوازی) وەکو ئاکامی کاریگەریی تومۆرەکە.

## دیاریکردن

### تاقیکردنەوەی خوێن

ژماری سـەرجەمی خانەکانی خوێن[١٨٢] بۆ دەسـتنیشـانکردنی ئانیمی وەکو ئـاکـامی خوێنبەربوون، تێکچوونی کـاری ئـاسـایی جگەر یـان خواردنی خۆراکی نەشیاو.[١٨٣] لە نزیکەی ٣٠٪ی نەخۆشـەکاندا ئانیمی دەبینرێ.

* ئەلێکترۆلیتەکان و تاقیکردنەوەی کاری جگەر بۆ هەڵسـەنگاندنی بارودۆخی کلینیکیی نەخۆش.

---

[174] Peritoneal and pleural effusions
[175] Outlet
[176] Anastomosis
[177] Intrahepatic jaundice
[178] Extrahepatic jaundice
[179] Inanition
[180] Starvation
[181] Cachexia
[182] Complete blood count (CBC)
[183] Poor nutrition

* نیشانەکەرەکانی تومۆر. لە نزیکەی یەک لە سێی ئەو نەخۆشانەدا کە تووشی شێرپەنجەی سەرەکیی گەدە بوون، ڕادەی (CEA)[١٨٤] لە سەرەوەیە. پلەی هەستیاری[١٨٥]ی (CEA) وەکو نیشانەکەری شێرپەنجەی گەدە لە ئاستێکی نزمدایە، بەڵام چوونەسەرەوەی هاوکاتی لەگەڵ نیشانەکانی دیکە وەک (CA 19-9)[١٨٦] یان (CA50)[١٨٧] لەوە دەچێ ڕادەی هەستیارییەکە بە بەراورد لەگەڵ (CEA) بە تەنها بەرز بکاتەوە.

**ئیندسکۆپی** وەکو باشترین ئامراز بۆ دیاریکردنی شێرپەنجەی گەدە پێناسە دەکرێ و لە شوێنی یەکەم بۆ دەستنیشانکردنی ڕاستەوخۆی شێرپەنجەی گەدە، هەڵسەنگاندنی دیواری گەدە و تووشبوونی لیمفەگرێکان، هەروەها بیوپسی تان و پۆی گەدەدایە. کاتی بیوپسی، بە لایەنی کەمەوە هەڵگرتنی ٦ نموونە لە بەری زامەکە پێویستە. لە بوارگەلێکدا لەوە دەچێ **ئیندسکۆپیک سۆنۆگرافی**[١٨٨] نەخشێکی یاریدەدەری بۆ هەڵسەنگاندنی قووڵایی پەرەسەندنی تومۆر یان تووشبوونی پێکهاتە دراوسێیەکان هەبێ. لە کاتی ئیندسکۆپیدا کەڵکوەرگرتن لە مادەگەلی ڕەنگی، وەکو میتیلی شین[١٨٩] یاخود ڕەنگی شینی ئاسمانی[١٩٠] یارمەتیی دیاریکردن و جیاکردنەوەی کەندولەندی[١٩١] موکۆس و نارێکوپێکییەکان دەدا. هەروەها بە یاریدەی **زوومگاستروسکۆپی**[١٩٢]، دەکرێ ئەندازەی موکۆس (بۆ قۆناخبەندیکردن) لە ١٥ هەتا ١٥٠ جار گەورەتر بکرێتەوە. بۆ دەستنیشانکردنی میتاستازی سییەکان کەڵک لە ڕادیۆگرافیی سینگ

---

[184] Carcinoembryonic antigen
[185] Sensitivity
[186] Cancer antigen (CA) 19-9
[187] Cancer Antigen 50
[188] Endoscopic ultrasound
[189] Methylene blue
[190] Indigo
[191] Reliefs
[192] Zoom gastroscopy method

وەردەگیرێ. کاتی گومانکردن لە شێرپەنجەی گەدە، **کامپیوتێرتوموگرافی و وێناکردنی زرنگانەوەی موگناتیسیی** سک و کۆجیلەی سمت (لەگەن، کاسیلکە)[193] یارمەتیی هەڵسەنگاندنی ڕەوتی خۆجێی نەخۆشییەکە، هەروەها تەشەنەکردن و قۆناخبەندیی تومۆر دەدەن. لە چەشنی I و II سیویێرتدا ئەنجامی کامپیوتێرتوموگرافیی سینگ پێویستە. ئەمڕۆکە ڕادەی بەکارهێنانی **توموگرافی تەواوی جەستە بە دەردانی پۆزیترۆنەوە** بۆ دیاریکردن و هەڵسەنگاندنی تومۆر و قۆناخەکانی شێرپەنجە تا ڕادەیەک زیادی کردووە و پلەی هەستیاری بۆ کارسینۆماتۆزی پەردەی سک[194] ٥٠٪یە.

**لاپراسکۆپی**[195] ئەمڕۆ بووە بە یەکێک لە شێوەکانی هەڵسەنگاندنی قۆناخی شێرپەنجەی گەدە و ڕوونکردنەوەی وێچوونی ڕێزەکسیۆنی تومۆر پێش دەستپێکی چارەسەر. هۆی بنچینەیی بۆ قۆناخبەندیی لاپراسکۆپی بریتییە لە نزمبوونی پلەی هەستیاریی کامپیوتێرتوموگرافی بۆ دەستنیشانکردنی میتاستازگەلێک کە



شیرپەنجەی پەرەگرتووی گەدە لە چەشنی بلاوبووە

ئەندازەیان ٥ میلیمەتر و کەمترە. لاپراسکۆپی هەل و دەرفەتی

---

[193] Pelvis
[194] Peritoneal carcinomatosis
[195] Laparascopy

راســــتەوخۆ بۆ تێڕوانین، بە وردی ســــەیرکردن و تێڕوانینی ڕووی پەردەی سک و هەناو پێک دەهێنێ. لە ڕەوتی دیاریکردنی شێرپەنجەی گەدەدا کەڵک لە **ئیمۆنوهیســـتۆلۆژیک**[196] و **ڕەنگکردنی- Periodic acid–Schiff**، هەروەها **هیپێرتۆن دیۆدینۆگرافی**[197] وەردەگیرێ.

## چارەسەر

### کورتەپێداچوونەوەیەک لە سەر دەرمانی شێرپەنجەی گەدە:

### دەرمانی شێرپەنجەی گەدە بەپێی قۆناخبەندیی تی ئێن ئێم

| | |
|---|---|
| T1a N0 M0 – ترایی<br>موکۆسکارسینۆم، کارسینۆمی پێشوەختی گەدە | ڕیزەکسیۆن لە ڕێگەی ئێندسکۆپییەوە |
| تەواوی قۆناخەکانی T1b | گاسترئەکتۆمی تەواو یان بەشێک لە گەدە لەگەڵ لیمفئەکتۆمیD2 |
| قۆناخەکانی T3 و T4b | سەرەڕای نەشتەرگەری، شیمۆدەرمانیی یاریدەدەری نوێ لەگەڵ<br>Oxaliplatin ، 5- Fluorouracil و Capecitabin<br>پێویستە. |
| شوێنێک کە بۆ نەشتەرگەری نەبێ یان تووشی میتاستازی M1 بووبێ. | شیمۆدەرمانی ئازارشکێن (سوکناییدەر) |

وێچوونی چارەســەرکردنی کارســینۆمی گەدە بە ئامانجی چاککەرەوە تەنها لە ڕێگەی ڕیزەکســـیۆن و لیمفئەکتۆمی شـــیاوەوەیە. بوونی

196 Immunohistochemical methods
197 Hypotoner duodenography

دەرفەتی پێویســـــت بۆ برین و دەرهێنـانی مـاکرۆســـکۆپیک و میکروســـکۆپیکی تەواوی تومۆر و ســـیســـتەمی لیمفبەرەکان (Ro-resection) مەرجی بنەڕەتییە بۆ ئەم مەبەستە. زۆر جار سەرهەڵدانی ئالۆزییەکانی پاش نەشـــتەرگەری و مـامنـاوەنـدی زینـدوومـانەوەی نەخۆش تەنهـا بۆ مـاوەی ٧ هەتـا ١١ مـانـگ لە پێوەنـدی لەگەڵ ڕێزەکســـیۆنی نـاتەواودایە (R1- R2 resection). لە قۆنـاخەکـانی ســـنووورداری خۆجێیـدا[198] (قۆنـاخەکـانی IA, IB و II) لە ٩٥٪ی بوارەکاندا وێچوونی ڕێزەکسـیۆنی Ro هەیە، لە قۆناخی پەرەگرتووی خۆجێییدا کە لە دوو لە ســێی نەخۆشـــەکان لە کاتی دیاریکردندا دەبینرێ، ڕادەی ســـەرکەوتوویی ڕێزەکسـیۆن تەنها ٤٠٪ە. بۆ ئاکامی باشـتری دەرمان، بە تایبەتی لەو نەخۆشـانەی کە تووشی کارسینۆمی پەرەگرتووی خۆجێیی گەدە بوون، پێش یـان پـاش نەشـــتەرگەری زێدەدەرمانی[199] وەکو شـیمۆتراپیی سـیسـتەمیک پێویسـتە، بەڵام بە دەگمەن تیشکدەرمانی ئەنجام دەدرێ.

**ئیندیکاسیۆنی بنەڕەتی بۆ دەرمانی کۆنسێرواتیزی کانسەری گەدە بریتییە لە:**

* دەرمانی یاریدەدەری پاش نەشـــتەرگەری (ڕێزەکســـیۆنی Ro) بە مەبەستی چاککردنەوە لە نەخۆشی بە مەترسیی بەرزەوە.

* زێدەدەرمـانی پـاش نەشـــتەرگەری لە پاشـــماوەی تومۆردا[200] بە مەبەستی درێژەدان بە ماوەی زیندوومانەوەی نەخۆش.

* بە بەکـارهێنـانی دەرمانی یاریدەدەری نوێ هەوڵ دەدرێ لە ڕێگەی بچووککردنەوەی ئەنـدازەی تومۆری ســـەرەتـایی (Down sizing) پـانتـایی ڕێزەکســـیۆنی R0 زۆرتر بکرێ، هەروەهـا بە دەرمـانکردنی

---

[198] Local
[199] Additive therapy
[200] Residual tumor

پێشـــوەختی میکرومێتاســـتازەکان یارمـەتیی باشـــتربوون و بەرزکردنەوەی ڕێژەی چاکبوونەوەی ئەم نەخۆشانە بدرێ.
* دەرمانی ســـوکنایيدەر پێشـــگیری لە ســـەرهەڵدانی پێشـــوەختی سیمپتۆمەکان دەکا، هەروەها ژەهراویبوون بە هۆی چارەسەر[٢٠١].

## شیمۆتراپیی یاریدەدەری نوێ

لە قۆناخی T3 و T4ی کارسـینۆمی گەدەدا، کە وێچوونی چارەســەر بە نەشـــتەرگەریی هەیە، شـــیمۆتراپی بۆ چکۆلەکردنەوەی ئەندازەی تومۆر و باشترکردنی ئاکامی نەشتەرگەری پێشنیاز دەکرێ. بۆ وێنە، دەکرێ ئەم چارەســـەرە بە یاریدەی کۆی: Cisplatin و 5 fluorouracil یاخود Epirubicin, Cisplatin, Fluorouracil بێ.
لێکۆڵینەوەکـان هەروەهـا نیشـــانـدەری کـاریگەریی بـاشـــی کۆی Capecitabin و Oxaliplatn یاخود Docetaxel, Oxaliplatin, Fluorouracil، هەروەهـا Capecitabin, TexaneIrinotecan بۆ درێـژەدان بە مـاوەی زیندوومانەوەی نەخۆشـن. لەو نەخۆشـانە کە وێچوونی چارەســەری نەخۆش لە ڕێگەی نەشـــتەرگەرییەوە نییە، یـان تووشـــی تومۆری پەرەگرتووی خۆجێیی بوون، لەوە دەچێ کۆی Epirubicin,Cisplatin و 5 Flourouracil یـان Methotrexat, Adriamycin و 5 Fluorouracil، هەروەها Etoposide, Adriamycin و Cispltin بە کەڵک بێ.

## ئامادەکاریی پێش نەشتەرگەری

بە گشـتی، پێویسـتە پێش نەشـتەرگەری هەرچەشـنە کەمایەسـییەکی نەخۆش، بە تـایبەتی لە پیرەکـانـدا، قەرەبوو بکرێتەوە و نەخۆش لە باری جەســتەییەوە ســەقامگرتوو بێ. کاتی تەسـکیی بەرچاوی بەشـی کۆتایی گەدە، لەوە دەچێ پێویسـت بە دانانی زۆندی لوت – گەدە بێ. هەروەها بەپێی بارودۆخی نەخۆش لەوە دەچێ پێش نەشـــتەرگەری

---

201 Treatment-related toxicity

پێدانی ئینفیوژن، ترانسفیوژنی خوێن، هەروەها ئانتیکواگولاسیۆنتراپی (بۆ وێنە هێپارین بە کێشی مۆلیکۆلیی کەمەوە)، هەنگاوی جەستەیی دژەمەیینی خوێن (بۆ وێنە کەڵکوەرگرتن لە گۆرەویی دژەمەیینی خوێن)، ئانتیبیۆتیک پرۆفیلاکسی بۆ تەنها جارێک[٢٠٢]، بۆ وێنە پێدانی میترانیدازۆڵ (Metranidazol) و کۆنترۆڵی ئەلیکترۆلیتەکان پێویست بێ. پێش هەرچەشنە نەشتەرگەرییەکی گەورە لە زگ و بە تایبەتی دوو بۆشایی لەش (سک و سینگ) فێرکاری و ژیمناستیکی هەناسەکێشان پێشنیاز دەکرێ.

## ستراتیژیی نەشتەرگەری

ئامانجی سەرەکیی هەر چەشنە نەشتەرگەرییەک لە کارسینۆمی گەدەدا بریتییە لە ڕێزەکسیۆنی تەواوی تومۆر و ناوچەی لیمفەبەرەکان. "ڕێزەکسیۆنی تەواو" ئەم بوارانە لە خۆ دەگرێ:

* **تومۆری سەرەتایی** (بەبێ بەجێمانەوەی تومۆر لە ئاستی دەم[٢٠٣] و دوور لە دەمی[٢٠٤] لێواری ڕێزەکسیۆن و لە پانتایی تومۆرەکەدا[٢٠٥].
* **لیمفەبەرەکانی تومۆرەکە** (بەبێ بەجێمانەوەی تومۆر لە لیمفەگرێکانی پەراوێز[٢٠٦] یان سەرسنوور[٢٠٧]).

بۆ باشتربوونی پرۆگنۆزی نەخۆش پێویست بە بڕین و لابردنی تومۆر بە مەودایەکی شیاو یان مەودای پارێزگەرە[٢٠٨]، بۆ وێنە، پێنج سانتیمەتر لە چەشنی ڕیخۆڵەیی و ٨ سانتیمەتر لە چەشنی بڵاوەدا.

---

202 Als Single-Short
203 Oral
204 Aboral
205 Tumor area [tumor bed]
206 Peripheral lymph nodes
207 Lymph nodes borders
208 Safety distance

## چەشنەکانی نەشتەرگەریی شێرپەنجەی گەدە

* **تۆتال گاسترکتۆمی**[٢٠٩] (بڕین و لابردنی گەدە بە یەکجاری)، کاتێک بۆ لێواری نەرێنی پێویست بێ.
* **ئەیزۆفاگۆگاسترئەکتۆمی**[٢١٠] بۆ تومۆری بەشی کاردیای گەدە و شوێنی بەیەکگەیشتنی گەدە و قوڕیژنک.
* **سابتۆتال گاسترئەکتۆمی**[٢١١] (بڕین و لابردنی نیمچەتەواوی گەدە. ڕیزەکسیۆنی ٨٠٪ی گەدە) بۆ شێرپەنجەی بەشی دیستالی گەدە.
* **دیسێکسیۆنی لیمفەگرێکان.**

هەڵبژاردنی چەشنی نەشتەرگەری و پانتایی ڕیزەکسیۆنە لە پێوەندی لەگەڵ ڕادەی بڵاوبوونەوەی شێرپەنجە لە دیواری گەدەدا و تەشەنەکردنی بە نێو ئەندامە دراوسێیەکان و لیمفەگرێکاندا. لە کارسینۆمی کۆرپوس (تەنەی گەدە)دا تۆتال گاسترئەکتۆمی پێویستە. سازکردنەوەی بەردەوامی دەزگای هەرسکردن لە ڕێگەی تەکنیکی Roux-en-Y ئەیزۆژژیۆنۆستۆمی[٢١٢]یەوەیە. لەوە دەچێ ئەم کارە پاش نەشتەرگەری هۆی باشتربوونی چۆنێتیی ژیانی نەخۆش بێ. شێرپەنجەی ئانترۆم (لە سێیەکی دیستال و پیلور) لەوە دەچێ لە ڕێگەی سابتۆتال دیستال گاسترئەکتۆمییەوە چارەسەر بکرێ. دەکرێ سازکردنەوە لە ڕێگەی تەکنیکی هاوشێوەی بیلیرۆتی I و II بێ. تەکنیکی YRoux-en ئەیزۆژژیۆنۆستۆمی بۆ بەرگریکردن لە ڕەفلاکسی زراو بۆ نێو گەدە، هەروەها واگۆتۆمی بۆ پێشگیری لە زامی پێپتیکی شوێنی ئاناستۆمۆز پێشنیاز دەکرێ. ئەیزۆفاگۆگاسترئەکتۆمی شێوەی هەڵبژاردەیە بۆ شێرپەنجەی دەمی

---

209 Total gastrectomy
210 Esophagogastrectomy
211 Subtotal gastrectomy
212 Oesojejunostomy

گەدە. لە کاتی بڵاوبوونەوەی بەربڵاوی کارسینۆم یاخود چەشنی **"چواری بۆرمان"** بەبێ لەبەرچاوگرتنی حاڵەتی تۆپۆگرافیک (ناتەواو یاخود تۆتاڵ) تۆتاڵ گاسترئەکتۆمی و لیمفئادنئەکتۆمی، نەشتەرگەریی هەڵبژاردن. دوابینیی نەخۆش لە پێوەندی لەگەڵ ڕادەی تەشەنەکردنی کارسینۆمە بۆ لیمفەگرێکان. دیسێکسیۆنی لیمفەگرێکان بریتییە لە D1 یان بڕین و لابردنی لیمفەگرێکانی پریگاستریک[٢١٣]، یانی ناوچەی ١ هەتا ٦ی لیمفەگرێکان و D2 یان بێجگە لە D1، بڕین و لابردنی ئەو لیمفەگرێیانە کە لە درێژایی گەورە خوێنبەرەکانی جگەر، بەشی چەپی گەدە، سیلیاک و سپڵ، هەروەها لیمفەگرێکانی نێوکی سپڵ[٢١٤]دان، بە واتایەکی دیکە، لیمفەگرێکانی ناوچەی ٧ هەتا ١١. پانتایی دیسێکسیۆنی لیمفەگرێکان تا ڕادەیەکی زۆر قسەهەڵگرە و جیاوازییەکی بەرچاو



وێنەگرتنی پاش گاسترۆئەکتۆمیی و سەرلەنوێ سازکردنەوەی بۆریی Roux-Y

سەبارەت بە پانتایی لیمفئادنئەکتۆمی لە نێوان دەزگاکان (نەخۆشخانە،

---

213 Perigastric lymph nodes

214 Splenic hilum

زانســتگا) لە ولاتە جۆراوجۆرەکان هەیە. بۆ وێنە، لە ژاپۆن و کۆریای باشـوور بۆ تەواوی ئەو تومۆرانە کە شیاوی نەشتەرگەرین، بێجگە لە تومۆرەکـانی T1، لیمفئەکتۆمی D2 ســـتـاندارده، بەڵام لە ئەمەریکـا لیمفئـادنئەکتۆمی بە پـانتـاییەکی کەمتر دەبینرێ. هیچ جیـاوازییەکی بیرورِا ســـەبارەت بەم مەســـەلەیە کە لیمفئادنێکتۆمی D1 کەمترین رِێژەی لـیمفئـادێنئەکتۆمی لە ئـادنۆکـارســـینۆمی گەدەدایە، نییە. لێکۆڵینەوەی جۆراوجۆر سـەبارەت بە رِێژەی نەخۆشی و مردنی پاش لیمفئەکتۆمی D1 لە بەرامبەر D2 کراوە کە تەبابیەکی وەهایان پێکەوە نییە. بۆ وێنە، لە یەکێـک لە لێکۆڵینەوەکـانـدا رِادەی نەخۆشـــی پـاش نەشـــتەرگەری (بە رِیز: ٤٢٪ لە بەرامبەر ٢٥٪ بووە) و رِادەی مردن (٨٪ لە بەرامبەر ٤٪ بووە) بە بەرزبوونەوەی ئەم ئـاســـتە لە گرووپی D2دیتراوە، بەڵام لە لێکۆڵینەوەیەکی دیکەدا ئەم رِادەیە بۆ ئاڵۆزییەکانی پاش نەشتەرگەری لە ئاستێکی خوارتردا بووە.

## ئاڵۆزییەکانی نەشتەرگەری

لە پێوەندی لەگەڵ نەشـــتەرگەریی گەدەدا لەوە دەچێ ئەم ئاڵۆزییانە سەرهەڵبدەن:

**ئاڵۆزی لە کاتی نەشتەرگەریدا:**

* بریندارکردنی[215] پێکهاتە دراوســـێیەکان (وەکو ســـپڵ، پەنکریاس، جگەر، بۆریی گشـــتیی زیلـک) و/ یـان خوێنبەربوون لە کـاتی نەشتەرگەریدا.

[215] Injury to

## ئالۆزیی پێشوەختی پاش نەشتەرگەری:

* خوێنبەربوونی پاش نەشتەرگەری لە پێوەندی لەگەڵ هیموستازی ناشیاو[٢١٦] لە کاتی نەشتەرگەریدا. لەوە دەچێ شوێنی ئاناستۆمۆز[٢١٧] سەرچاوەی خوێنبەربوون بێ بۆ نێو بۆشایی گەدە[٢١٨].

* دەلاندن یان لێچوونی ئاناستۆمۆتیک[٢١٩] بە هۆی ناشیاوبوونی تەکنیکی نەشتەرگەری یان لاوازی و ناتەواویی تان و پۆ بۆ ساڕێژبوونەوە، بە هۆی هیپۆئالبومینیمی[٢٢٠] یان بڵاوبوونەوەی تومۆر. لەوە دەچێ ئەم حاڵەتە لە نێوان ڕۆژەکانی ٤ هەتا ٧ی پاش نەشتەرگەری ڕوو بدا و هۆی چوونەسەرەوەی ڕێژەی مردنی نەخۆش بێ.

## ئالۆزیی درەنگوەخت یان سیندرۆمی پاش نەشتەرگەری

* سیندرۆمی دامپینگ بۆ دوو چەشنی پێشوەخت و درەنگوەخت دابەش دەکرێ. نیشانەکانی دامپینگی پێشوەخت (وەکو سکئێشە، سکەشۆرە، دڵتێکهەڵهاتن و ڕشانەوە، ئارەقەکردن، دڵەکوتە، سەرەگێژە و هەستکردن بە ماندوێتی و لاوازی) ٢٠ خولەک پاش نانخواردن سەرهەڵدەدا و لە پێوەندی لەگەڵ خاڵیبوونی خێرای تێئاخنراوی هایپێرئێسمولاری گەدە بۆ نێو ڕیخۆڵەباریکەدایە. سیندرۆمی درەنگوەختی دامپینگ یەک سەعات و نیو هەتا سێ سەعات پاش نانخواردن بە هۆی ئازادبوونی لەڕادەبەدەری ئینسولین و سەرهەڵدانی هیپۆگلیسیم ڕوو دەدا. لەم حاڵەتەدا نیشانەگەلێکی وەکو لاوازی، ئارەقەکردن، نائارامی و بوورانەوە دەبینرێن.

---

216 Improper hemostasis
217 Luminal bleeding
218 Anastomotic site
219 Anastomotic leakage
220 Hypoalbuminemia

* گەنەخۆری (بەدخۆراکی)[221] لە سابتۆتال گاسترئەکتۆمی بە بەراورد لەگەڵ تۆتالگاسترئەکتۆمی کەمتر باوە. کەمبوونی ئاسن، ڤیتامین B12 و کالسیۆمی خوێن، هەروەها دابەزینی قورسایی لەش لە ئاڵۆزییەکانی پاش نەشتەرگەرین.

* لەم نەخۆشانەدا لەوانەیە زامی گەدە سەرهەڵبداتەوە.

شـێرپەنجەی بنەی گەدە[222] زۆرتر پاش سـازکردنەوەی بیلیرۆت[223]ی II دەبینرێ هەتـا بیلیرۆتی I. لە پـاتۆژنێزی ئەم حـاڵەتەدا فـاکتەرە سـەرەکییەکـان بریتین لە: ڕەفلاکسـی ئێنترۆگـاسـتریـک[224]، ئاکلۆرهیدری[225]، زۆربوونی بـاکترییەکـان و هەو بە هۆی کـاریگەریی هلیکۆباکترپیلوری. مەترسـیی سەرهەڵدانی شێرپەنجەی بنەی گەدە ١٠ ساڵ یان پتر لە ١٠ ساڵ پاش ڕێزەکسیۆنی گەدەیە.

## تیشکدەرمانی لە کاتی نەشتەرگەریدا[226]

قۆناخی سـەرەتایی گەشـەسـەندنی ئەم تیشـکدەرمانییە کە ئەمڕۆ لە جیهـانـدا بـاوە، لە کلینیکی زانسـتگـای کیۆتۆی ژاپۆن و لەژێر سـەرپەرشـتیی "میگومی ئەب"[227]دا تێپەڕ بوو. ئەم شـێوە دەرمانکردنە پێکهاتەیەکە لە نەشـتەرگەری و تیشـکدەرمـانی. لە کـاتی بڕین و دەرهێنـانی تومۆر لە ڕێگەی نەشـتەرگەرییەوە زۆر جـار تەواوی قەبارەی تومۆر دەرناهێنرێ و بەشـێک لە خانە شـێرپەنجەییەکان دەمێننەوە. بۆ بـاشـترکۆنترۆڵکردنی ئەو بەشـەی دەرمـان دەکرێ، ڕادەیەکی زۆری تیشک لە یەک کەڕەتدا لەو شوێنە دەدرێ، ئەمەش لە حـاڵێکدایە کە هەموو یـان بەشـێکی زۆر لە تـان و پۆی دەوری ئەو

221 Malnutrition
222 Gastric stump cancer
223 Billrothreconstruction
224 Enterogastric reflux
225 Achlorhydria
226 Intraoperative radiotherapy (IORT)
227 Megumi Abe

ناوچەیە کە لە ژێر دەرماندایە، دادەپۆشـــرێ یان لە دەرەوەی پانتایی تیشکەکەدا ڕادەگیرێ. بە باوەڕی بەشێک لە نووسەران، تیشکدەرمانی ئاکامێکی باش و هیوابەخشی هەیە.

**هەنگاوگەلی سوکناییدەر (ئازارشکێن)**

لە نزیکەی نیوەی نەخۆشـــەکاندا شـــێرپەنجەی گەدە لە قۆناخی IVدا دیاری دەدا و هەر ئەمە گرینگیی هەنگاوگەلی سوکناییدەر نیشان دەدا. دەرمانی سوکناییدەر بۆ کەمکردنەوەی نیشانەکانی ئەم **نەخۆشییە**، بە تایبەتی ئێش، هەروەها باشـــترکردنی چۆنێتیی ژیان، کاتێک بەکار دێ کە دەرەتانی چارەســـەری یەکجاریی شـــێرپەنجەی گەدە نەمابێ. لە ڕەوتی دەرمانکردنی ســـوکناییدەردا کەڵک لە شـــێوەگەلی جۆراوجۆر وەکو نەشـــتەرگەری، شـــیمۆدەرمانی و ڕادیاســـیۆنی ســـوکناییدەر وەردەگیرێ.

**لێکۆڵینەوەکانی گرووپی ئۆنکۆلۆژیی باشوور- ڕۆژئاوای ئەمەریکا (SWOG)[228] سەبارەت بە ڕادیۆشیمۆدەرمانیی یاریدەدەر**

بەپێی ئەو لێکۆڵینەوانە کە ســـەبـارەت بە ڕادەی کـاریگەریی شـــیمۆڕادیـاســـیۆنی پـاش نەشـــتەرگەری بە بەراورد لەگەڵ چارەســـەرکردنی ئەم نەخۆشـــییە تەنها لە ڕێگەی نەشـــتەرگەرییەوە کراون، شـــیمۆڕادیاســـیۆن کاریگەرییەکی باشـــی لەســـەر ڕێژەی زینـدوومـانەوەی نەخۆش بووە. بۆ وێنە، لە لێکۆڵینەوەی گرووپی ئۆنکۆلۆژیی باشـــوور و ڕۆژئاوای ئەمەریکا کە لەســـەر ٥٥٠ کەس کراوە، ئاکامی ڕادیۆشـــیمۆتراپیی یاریدەدەر (Leucovorin و 5-FU لە ڕۆژەکانی ١-٥ و ســـێ ڕۆژی کۆتایی ڕادیاســـیۆن، ٤٥ گرێی، ١٨ گرێی/ ڕۆژ) پـاش خولێـک لە هەمـان شـــیمۆتراپی و دوو حولی شـــیمۆتراپی دوابەدوای ئەو (Leucovorin/5-FU) بە بەراورد لەگەڵ ڕێزەکســـیۆن بە تەنهـا بـاشـــتر بووە، هەروەهـا مـامنـاوەنـدیی

---

[228]US Southwest Oncology Group(SWOG)

زیندوومانەوەی نەخۆش پاش ٣ ساڵ، ٤٢ مانگ بەرامبەر بە ٢٧ مانگ بووە.

دوو خشتەی باوی سیتۆستاتیکەکان[٢٢٩] بریتین لە:

خشتەی FAM

| ماده | دۆز mg/m2/d | لێدان | ڕۆژەکانی تراپی |
|---|---|---|---|
| 5-Fu | ٦٠٠ | i.v.-Bolus | ١،٨،٢٩،٣٦ |
| Adriamycin | ٣٠ | i.v.-Bolus | ١،٢٩ |
| Mitomycin | ١٠ | i.v.-Bolus | ١ |

خشتەی EAP

| ماده | دۆز mg/m2/d | لێدان | ڕۆژەکانی تراپی |
|---|---|---|---|
| Adriamycin | ٢٠ | i.v.-Bolus | ١،٧ |
| Cisplatin | ٤٩ | ئینفیوژن بە درێژایی سەعاتێک | ٢،٨ |
| Etoposid | ١٠٠(١٢٠) | ئینفیوژن بە درێژایی سەعاتێک | ٤،٥،٦ |

229Cytostatca

ئامانجی تایبەتیی سـیتۆسـتاتیکە ئەمڕۆییەکان بەربەسـتی ڕەوتی دابەشـین و پەرەسـەندنی خـانەکانی شـێرپەنجەیە لە تومۆری دیاریکراودا. لە ڕەوتی چارەسـەرکردنی شـێرپەنجەی گەدەدا کەڵک لە دوو دەوای ترازتوزوماب[230] و ڕاموسیروماب[231] وەردەگیرێ.

**ئاڵۆزییە لاوەکییەکانی شـیمۆتراپی بریتین لە:** هەسـتکردن بە لاوازی، دڵتێکهەڵهـاتن و ڕشـانەوە، تووکوەرین، موکۆسـیتی[232] نێو دەم و دەزگای هەرسکردن، کەمخوێنی، گۆڕانی ڕەوتی خوێنسازی لە مۆخی ئێسـک،[233] کارسـینۆژێنیکبوون (لوسـێمی کتوپڕی میلۆیدیی[234])، ئاریتمی، ناتەواویی دڵ، ئازاری ماسـوولکەی دڵ، یاو، سـکەشـۆرە، ئێشی ماسوولکە، نەوەسانی گوشاری خوێن و هتد...

## شوێنگرتن

پرۆفیلاکسـی و چارەسـەری ئاڵۆزییەکانی پاش گاسـترئەکتۆمی، ئـامۆژگـاریی خۆراکخواردن، کۆنترۆڵی قورسـایی لەش، پێـدانی ئەنزیمەکانی پەنکریـاس لە کـاتی نـانخواردن و خواردنی ڤیتـامینەکـان، وەکو بی ١٢ بە درێژایی ژیـان، هەروەهـا چـاودێریی پزیشـکی بۆ کـۆنـتـرۆڵـی سـەرهەڵـدانەوەی تـومـۆری نەخـۆش لە ڕێـگەی ئەیزۆفاگۆگاسترۆسکۆپی، سۆنۆگرافی و نیشانەکەرەکانی تومۆر.

## دوابینی

---

230 Trastuzuma

231 Ramucirumab

232 Mucositis

233 Bone marrow

234 Acute myeloid leukemia

زیندوومانەوەی نەخۆش بۆ ماوەی ٥ سـال پاش نەشـتەرگەریی چاککەرەوە لە پێوەندی لەگەڵ قۆناخی نەخۆشـی، پەرەسـەندن و تەشەنەکردنی شێرپەنجەدایە:

| قۆناخبەندیی تی ئێن ئێم | زیندوومانەوە بۆ ماوەی ٥ ساڵ (٪) |
|---|---|
| PTis | ١٠٠ |
| pT1 | ٩٠ |
| pT1N1M0یان pT2N0M0 | ٧٠ |

لە حاڵەتی پەرەسەندنی کارسینۆمدا دوابینیی مامناوەندی زیندوومانەوەی نەخۆش بەپێی پۆلبەندیی R–ە. لە ڕێژەکسیۆنی R0دا مامناوەندی زیندوومانەوەی نەخۆش لە ٤٥٪ و کەمترە. لە ڕێژەکسیۆنی R1 و R2 بە دەگمەن ماوەی زیندوومانەوەی نەخۆش ٥ دەگاتە ساڵ.

# سەرچاوەکان

1. Richard S. Eisenstaedt, MD, FACP: Profesor of Medicine &..... MKSAP 16, Gastric Cancer, p. 83. Hematology and Oncology 2015, ACP, USA
2. Amy S. Oxentenko, MD, FACP, Editor, and Assistant Professor of Medicine&... MKSAP 16, Gastric Adenocarcinoma p. 20-22, Gastroenterology and Hepatology. 2015, ACP, USA
3. Christina Wittekind, Patologie und Klassifikation des Ösophagus und magenkarzinoms, Aspekte derzeitigen Tumorklassifikation, Kinikarzt, Medizin für Krankenhaus, 7+8/ 2014, Demeter Verlag
4. Terence D Rhodes, MD, PhD: Chief Editor: Jules E Harris, MD more... Gastric Cancer Staging. Updated: Jan 17, 2014. http://emedicine.medscape.com/article/2007213-overview
5. Peter W.T Pisters &.... Section 3, Cancer of Stomach. DeVita, Hellman, and Rosenberg's Cancer, Princeples & Practice of Oncology, Volume One, , 8th edition, Lippncott Williams&Wilkins 2008
6. A. Sendler, F Lordic, A. Tannapfel, Magenkarzion, Hiddemann, Bartram Die Onkologie, Teil 2, 2 Aufgabe, Springer 2010
7. Grading and classification of stomach cancer https://www.cancer.ca/en/cancer-information/cancer-type/stomach/grading/?region=o
8. Stacy Carl-McGarth &... gastric adenocarcinoma: epidemiology, pathology and pathogenesis, Reviw Article. Cancer Therapy Vol 5, 877-894, 2007
9. Jampanese classification of gastric carcinoma: 3rd English edition, Gastric Cancer(2011)14:101-112, http://www.jgca.jp/pdf/JGCA_Jpn_Classification_3rd_Eng.pdf
10. Vikram Kate, MBBS, MS, PhD, FRCS, FRCS(Edin), FRCS(Glasg), MAMS, FIMSA, MASCRS, FACS, FACG: Chief Editor: Vinay Kumar Kapoor, MBBS, MS, FRCSEd, FACS, FACG, FICS, FAMS, Partial Gastrectomy , Updated: Apr 8, 2015http://emedicine.medscape.com/article/1893089-overview#showall
11. J Surg Oncol. Author manuscript: D1 Versus D2 Lymphadenectomy for Gastric Cancer, 2013 Mar: 107(3): 259–264. http://www.ncbi.nlm.nih.gov/pmc/articles/PMC3807123/
12. American joint committee on cancer (2002) AJCC cancer staging manual), 6th ed. Springer, New York, pp 99-106
13. Burian M, Stein HJ, Sendler a et al. (2004) Lymph Node beim Magen - und Ösophaguskarcizom Chirurg 75: 756-770.

14. Centre for Evidense Based Medicine (CEBM). Oxford Centre for evidence –based medicine – Levels of evidence (March2009).
15. Chadha MK Kuvshinoff BW, Javle MM.Neoadjuvant therapy for gastric cancer. Oncology (Williston Park) 2005, 19 (9): 1219-27.
16. Crehange G, bonnetain F ,Chauffert B, Rat P ,Bedenne L, Maingon P . resectable adenocarcinoma of the oesophagogastric junction care: which perioperative treatment?. Cancer Radiother 2008 ؛ 12 (5): 365-73
17. C. Thomas: Nistopathologie. Stuttgart, 2006, s. 139.
18. Cunningham D, Allum WH (et all ). 2006, perioperative Chemotherapie versus Surgery alone vor resectable Gastrooesophageal-Cancer). Ningl. J med 355: 11 – 20.
19. Deutsche krebshilfe , aktzelle Statistk 2013
20. Earle CC, Maroun J, Zuraw L. Neoadjuvant or adjuvant theraoy for resactable gastric cancer? A practica guideline. Can J Surg 2002 ؛ 45 (6).438-46
21. Fiorica, Cartei F., Ventueri A. et al, 2005, Impact of Combiened exteral Radiotherapy an Servival in Gastric-Cancer: Systematic review and mater analysis intij radiation onkol biol phys 63: 280-281
22. G. Woeste,S. E. Al. Bartan,J. Trojan: Diagnostik und Therapie des Magenkarcinoms.In: Onkologe. 2014 ؛ 20. S. 1139-1152. doi: 10. 1007/s00761-014-2792-1
23. Hermanek P, Junginger th, Hossfeld DK et al ,(1999) Nachsorge und Rehabilitation bei Patienten mit gastrointestinalen Tumoren Dtsch. Ärztebl.96A ؛ : 2084-2088.
24. Hinkelbein W., T, Wiegel: Management des Oesophagus- und des Magenkarzinoms Hrsg. H-J Meyer, H-J Buhr, H Wilke, Springer Verlag 2004).(Jähne J. 2004, Chirurgische Komplikationen in: Meyer H-J, Burr H.T., Wilke H, Hrsg. Management des Oesophagus- und Magenkarzinom. Springer, Berlin-Heidelberg-New York).
25. J. M. Noto, J. A. Gaddy, u. a.: Iron deficiency accelerates Helicobacterpylori-induced carcinogenesis in rodents and humans. In: The Journal of clinical investigation. Band 123, Nummer 1 , Januar 2013 S. 479-492, ISSN 1558-8238
26. K. Washington, 7 th edition of the AJCC cancer staging manual: stomach. In: Am Surg. Oncol. 17, 2010, S. 3077-3079.
27. Lordick F, Siewert JR. Recent advances in multimodal treatment for gastric cancer.a review. Gastric Cancer 2005 ؛ (2): 78-85.
28. Lagarde S, Scaglia E, Bouche O. chimiotherapie neoadjuvante des cancers gastriques resectables. Hepato-gastro 2007 ؛ 14 (1): 47-53

29. Mc Culloch P., Niitamr, Casi H et al 2005, Gastrectomie with extended Lymphadenectomie forprimär Threadment of Gastric-Cance Br j surg 92: 5-13
30. Mcdonnald JS, Smalley SR, Beneditti J et al.(2001) Chemoradiotherapy after surgery compared with surgery alone for adenocarcinoma of the stomach or gastroesophageal jznction.N Engle.J Med 345:725-730
31. Meyer, H-J, 2005 Die Influenz of Case load and extend of resection on the Quality of Treatment out come in Gastric-Cancer. E. J. So 31: 595-604.
32. Meyer, H-J, 2006, Magen-Duodenum in: Nagel E., Löhlein D, HRSG, Pichelmayr Chirurgische Therapie, 3. Auflage. Springer-Berlin-Heidelberg-New York).
33. M. Yehou, V. Boige, J. P. Pignon, T. Conroy, O. Bouche , G. Leberton (et all). Perioperative chemotherapy compared with surgery alone for resectable gastroesopgageal adenocarcinoma: an FNCLCC and FFCD multicenter phase III trial. In:J Clin. Oncol. 2011: 29 (13), S. 1715-1721.
34. Robert Mayer: Gastrointestinal Tract Cancer. In: Anthony Fauci u.a (Hrsg).Harrison,s principles of Internal Medicine. Band 1, New York 2008, S. 571-573.
35. Sacurai y, Uyama I, neoadjuvant and postoperative adjuvant anticancer chemotherapy in gastric cancer . Ann Surg omcol 2009 ؛ 16 (5):1444-5.
36. Samalin E, yehou M. le point sur le traitments adjuvante et neoadjuvante des adenocarcinimes oesophagogastriques Oncologie 2008 ؛ 10 (3) 175-81.
37. Shahi PK, Peron Y, Alfonso PG, Manga GP. Treatment of localized Gastric adenocarcinoma. Gastric & Breast Cancer 2008 ؛ 7(2).74-9.
38. Siewert JR, Stein HJ, Bartel H (2004) Insuffizienzen nach Anastomosen im Bereich des oberen Gastrointestinaltraktes. Chirurg 75: 1063-1070
39. The Cancer Genome Atlas Research Group: Comperhensive molecular characterization of gastric adenocarcinoma. In: Nature. 23. Juli 2014 doi: 10. 1038/nature13480
40. Wilke H, Willich N, Meyer HJ, Stahl M. Neoadjuvante und perioperative Therapie des Magenkarzinoms. Der Onkologe 2008 ؛ 14(4):370-80
41. WU AW XU GW, Wang HY JI JF, Tang JL WITHDRAWN: Neosdjuvant chemotherapy versus none for resectable gastric cancer. Cochrane Database syst Rev 2007 ؛ (4): CD005047.

42. Y. J. Bang, E. Van- Custem,A. Feyercislova, H.C. Chung, L. Shen, A. Sawaki(et all)ToGa Trial Investigators: Transcumab in combination with chemotherapy versus chemotherapy alone for treatment of HER2-positive advanced gastic or gastro-oesophageal junction cancer (ToGa): a phase 3, open-label, randomisrd controlled trial. In: Lancet.2010 : 376(9742), S. 687-697.
43. Zügel N, Bruer C Breitschaft K et al (2002) Einfluss der Thorakalen Epiduralanalgesie auf die frühe postoperative Phase nach Eingriffen am Gastrointestinsltrakt. Chirurg 73: 262-268
44. www.aco-asso.at
45. www.ssat.com
46. www.asco.org/1,1003,_12-002138,00.asp
47. www.cancercare.on.ca/pdf/pebc2-11f.pdf
48. www.cancer.gov/cancertopics7types/esophageal/
49. www.dkfz.de/index.html
50. www.difc.de/de
51. www.mmw.de/home.do
52.
www.difc.de/de/index.php?request=/de/forschung/projekte/epic.php

## بەشی سێیەم

## شێرپەنجەی پەنکریاس[235]

### پەتاناسی

لە تەواوی جیهاندا شێرپەنجەی پەنکریاس هەشتەمین هۆی مردنە لە نێو شێرپەنجەکاندا. لە زۆربەی وڵاتەکاندا ڕێژەی سەرهەڵدانی لە نێوان ٨ هەتا ١٢ لە هەر ١٠٠٠٠٠ کەسە لە ساڵدا. لە بەشێک لە وڵاتەکاندا ڕادەی سەرهەڵدانی لە ئاستێکی نزمدایە، بۆ وێنە لە هیندستان ٢ لە هەر ١٠٠٠٠٠ کەسە لە ساڵدا. لە ئەمەریکا چوارەمین هۆی مردنە بە هۆی شێرپەنجەوە و هەر ساڵ ٣٨٠٠٠ کەس بەم هۆیەوە گیانیان لە دەست دەدەن. سەرەڕای ئەوەی کە شێرپەنجەی پەنکریاس بە بەراورد لەگەڵ شێرپەنجەی کۆلۆرەکتاڵ بە چەشنێکی بەرچاو کەمترە، بەڵام ڕێژەی مردنی نەخۆشەکانی شێرپەنجەی پەنکریاس لە ساڵی یەکەمدا گەلێک بەرزترە. سەرهەڵدانی شێرپەنجەی پەنکریاس زۆرتر پاش تەمەنی ٥٥ ساڵییە و مامناوەندیی تەمەن بۆ دیاریکردنی ئەم شێرپەنجەیە لە سپیپێستەکاندا ٦٩ ساڵ و لە ڕەشپێستەکاندا ٦٥ ساڵە. ڕادەی سەرهەڵدانی لە نێو ژن و پیاودا تا ڕادەیەک لەیەک نزیکە.

---

[235]Pancreatic Cancer

## هۆ و فاکتەرە مەترسیدارەکان

تەمەنی سەرەوەی ٥٠ ساڵ یەکێکە لە گرینگترین فاکتەرە مەترسیدارەکان. جگەرەکێشان و پانکراتیتی درێژخایەن ڕادەی سەرهەڵدانی شێرپەنجەی پەنکریاس هەتا ٢٠ قات بەرز دەکەنەوە. پانکراتیتی میراتی وەکو ئاکامی موتاسیۆنی ژێنی کاتیۆنیک تریپسینۆژن[٢٣٦] هۆی نزیکەی ٤٠٪ی شێرپەنجەی پەنکریاسە. لە بەشێک لە لێکۆڵینەوەکاندا: قەڵەوی، نەخۆشیی شەکرە، خواردنی زۆری گۆشتی سوور و زۆرخواردنەوەی ئەلکول وەکو فاکتەرە مەترسیدارەکان لە قەڵەم دراون. لە ٥٪ هەتا ١٠٪ی نەخۆشەکاندا ڕابوردوویەکی بەهێزی بنەماڵەیی دیتراوە. موتاسیۆنی ژێنی BRCA2 (سیندرۆمی شێرپەنجەکانی میراتی مەمک و هێلکەدان) و ژێنی P16 (تومۆری قووڵەچینی پێست کە سەرچاوەی بنەماڵەیی هەیە) مەترسیی سەرهەڵدانەوەی شێرپەنجەی پەنکریاس بەرز دەکەنەوە. لەوە دەچێ سیندرۆمەکانی دیکەی وەکو لینچ، پویتز جێگێرز[٢٣٧] و ڤۆن هیپێل لینداو[٢٣٨] پێوەندییان لەگەڵ سەرهەڵدانی شێرپەنجەی پەنکریاس هەبێ.

## قەوارە و کاری پەنکریاس[٢٣٩]

نێوی پەنکریاس (شپیلک) لە دوو وشەی یۆنانی واتە "پان" (pan) بە مانای "هەموو" و "کریاس" (kreas) بە مانای "گۆشت و جەستە" سەرچاوەی گرتووە. پەنکریاس ئەندامێکی ڕەترۆپریتۆنیالی[٢٤٠] نەرم شکڵی "J" (وەکو داری یاریی هۆکی[٢٤١]) و ئەستوورییەکەی ٢ هەتا ٣ سانتیمەتر و درێژییەکەی ١٢ هەتا ١٥ سانتیمەترە. کێشی لە ژناندا ٨٥

[236] Cationic trypsinogen gene
[237] Peutz-Jeghers syndrome
[238] Von-Hippel Lundau syndrome
[239] Pancreas
[240] Retroperitoneal
[241] Hockey stick




گرام و لە پیاواندا تا ١٢٠ گرامە. ئەم ئەندامە بە حاڵەتی ئاسۆیی و تا ڕادەیەک لار لە پشت گەدە و بەرامبەر بە بڕبڕەی کەمەر [ناوقەد، سێوەنگ] (L1-2)دایە. پەنکریاس لە سێ بەشی سەر[٢٤٢]، جەستە[٢٤٣] و کلک[٢٤٤] پێک هاتووە، سەر بە تەنها ٥٠٪ و جەستە و کلک پێکەوە باقیی پەنکریاس پێک دێنن. سەری پەنکریاس لە نێو کەوانەی دوازدەگرێدا[٢٤٥]، کە بە شکڵی Cیە، جێگیر بووە و کلکی پەنکریاس لە حاڵەتێکی لاردا لە پشتی گەدەوە بەرەو سپڵ کێشراوە. پەنکریاس پێکهاتەیەکە لە ئاسینوس[٢٤٦] و دوورگەخانەکان[٢٤٧]. خانەکانی ئاسینوس ٩٥٪ و دوورگەخانەکان ١٪ هەتا ٢٪ی پەنکریاسیان پێک هێناوە. ئاسینوس یەکەی کاریی (فونکسیۆنالی) دەڵاوی بەرەودەری پەنکریاسە. ئاسینوس لە خانەکانی ئاسینوسی و ئێپیتەلیاڵی بۆری پێک هاتووە. پەنکریاس ئەندامێکی دوانەیە (دووفاقە)، واتە دەڵاوی بەرەودەر[٢٤٨] و دەڵاوی بەرەوژووری[٢٤٩] هەیە. دەڵاوی بەرەودەر بریتییە لە ئانزیمەکانی ئامیلاز[٢٥٠]،

---

242 Caput pancreatis
243 Corus pncreatis
244 Tail(cauda pancreatis)
245 Duodenal C loop
246 Acinus
247 Islet Cells
248 Exocrine
249 Endocrine
250 Amylase

لیپاز[٢٥١]، تریپسینۆژن[٢٥٢] و کیمۆتریپسیۆژن[٢٥٣] که له ڕێگەی ئامپۆلی واتەرەوە دەڕژێنه نێو دوازدەگرێ. سفینکتەری ئۆدی[٢٥٤] که له دەوری ئامپۆلی واتەردا[٢٥٥] جێگیر بووه، خێرایی چوونی ئەنزیمەکانی پەنکریاس و کیسەی زیلک بۆ نێو دوازدەگرێ کۆنترۆڵ دەکا. دەڵاوی بەرەوژوور بریتییه له هۆرمۆنەکانی ئینسولین[٢٥٦]، گلوکاگون[٢٥٧]، گاسترین[٢٥٨] و سۆماتۆستاتین[٢٥٩] که دەڕژێنه نێو خوێن. دەڵاوی ڕۆژانەی پەنکریاس نزیکەی یەک لیتر و نیوە. ئەم دەڵاوە نزیک به ٦ تا ٢٠ گرام له ئەنزیمەکانی هەرسکردن له خۆ دەگرێ. ئامیلاز بۆ هەرسکردنی کاربۆهایدراتەکان[٢٦٠]، تریپسین بۆ پرۆتینەکان و لیپاز بۆ چەورییەکان پێویستن.



ئادنۆکارسینۆمی بوریی پەنکریاس لەگەل رژینه نائاساییەکان (ئەستێرەکان) له نێو بنچینەی(سترۆمای) دیسموپلاستیکدا

[251] Lipase
[252] Trypsinogen
[253] Chymotrypsinogen
[254] Sphincter of Oddi
[255] Ampulla of vater
[256] Insulin
[257] Glucagon
[258] Gastrin
[259] Somatostatin
[260] Carbohyrate

## پاتۆلۆژی

شێرپەنجەی پەنکریاس زۆرتر بۆ لیمفەگرێ ناوچەییەکان و پاشان بۆ جگەر و کەمتر بۆ سییەکان تەشەنە دەکا. هەروەها ئەم شێرپەنجەیە ڕاستەوخۆ دەتوانێ دزە بکاتە نێو پێکهاتە دراوسێیەکانی وەکو گەدە، دوازدەگرێ و کۆڵۆن یان لە ڕێگەی پریتۆنیالەوە بۆ هەر یەک لە ڕووبەرەکانی چاڵی سک[261] تەشەنە بکا. سەرهەڵدانی ئاسیت (ئاوهێنانی سک) نیشانەیەکی مەترسیدارە لەم نەخۆشییەدا و دوابینییەکی باشی نییە. تەشەنەی شێرپەنجەی پەنکریاس بۆ پێست لە چەشنی گرێ ئێشدارە. میتاستازی شێرپەنجەی پەنکریاس بۆ ئێسکەکان باو نییە و بە دەگمەن دەبینرێ. لە ٨٠٪ی بوارەکاندا شوێنی سەرهەڵدانی شێرپەنجە لە سەری پەنکریاس و لە ٢٠٪دا لە شوێنەکانی دیکەی ئەم ئەندامەدایە. شێرپەنجەی پەنکریاس وەکو نەخۆشییەک کە بە زەحمەت دیاری و دەرمان دەکرێ و ئاکامەکەشی باش نییە، پێناسە دەکرێ.

### پۆلبەندیی TNMی شێرپەنجەی پەنکریاس

**T– تومۆری سەرەتایی**

**TX** تومۆری سەرەتایی بۆ هەڵسەنگاندن نابێ.

**T0** تومۆری سەرەتایی دیاری ناکرێ.

**Tis** کارسینۆم لە جێدا.

**T1** تومۆر بەستراوە بە پەنکریاسەوە و ئەندازەی ٢ سانتیمەتر یان کەمترە.

**T2** تومۆر بەستراوە بە پەنکریاسەوە و ئەندازەی لە ٢ سانتیمەتر گەورەتر و لە ٥ سانتیمەتر بچووکترە.

---

[261] Abdominal cavity

**T3** تومۆر بۆ دەرەوەی پەنکریاس پەرەی سەندووە، بەڵام دزەی نەکردووەتە نێو تەوەری سیلیاک[٢٦٢] یان خوێنبەری مێزەنتەریکی (ڕیخۆڵەبەندی) سەروو[٢٦٣].

**T4** تومۆر دزەی نەکردووەتە نێو تەوەری سیلیاک یان خوێنبەری مێزەنتەریکی سەروو.

**N– لیمفەگرێ ناوچەییەکان**

**NX** لیمفەگرێ ناوچەییەکان بۆ هەڵسەنگاندن نابن.

**N0** نیشانەیەک لە مێتاستازی لیمفەگرێ ناوچەییەکان نابینرێ.

**N1** سەرهەڵدانی مێتاستاز لە لیمفەگرێ ناوچەییەکاندا دەبینرێ.

**M – مێتاستازی دوور**

**M0** مێتاستازی دوور نابینرێ.

**M1** سەرهەڵدانی مێتاستازی دوور.

---

[262] Celiac axis

[263] Superior mesenteric artery

# قۆناخەکانی شێرپەنجەی پەنکریاس

| | |
|---|---|
| 0 | Tis/N0/M0 |
| قۆناخیIA | T1/N0/M0 |
| قۆناخیIB | T2/N0/M0 |
| قۆناخیIIA | T3/N0/M0 |
| قۆناخیIIB | T1/N1/M0<br>T2/N1/M0<br>T3/N1/M0 |
| قۆناخیIII | T4/هەر کام لە N-ەکان/M0 |
| قۆناخیIV | هەر کام لەMT-یەکان/ هەر کام لە N-ەکان/ M1 |

## نیشانەکان

لە قۆناخی سەرەتایی شێرپەنجەی پەنکریاسدا لەوانەیە نیشانەیەکی تایبەتی نەبینرێ. شێرپەنجەی پەنکریاس زۆر جار وەکو "**نەخۆشییەکی بێدەنگ**" پێناسە دەکرێ. لەو نەخۆشانەدا کە تووشی شێرپەنجەی سەری پەنکریاس بوون، زۆرتر زەردوویی بێئێش[٢٦٤] دەبینرێ. لە کاتی دیاریکردنی شێرپەنجەدا، لە نزیکەی ٦٠٪ی نەخۆشەکاندا بەستراوە بە کاریگەریی تومۆر لەسەر خانە بەرهەمهێنەرەکانی

---

[264] Painless jaundice

ئینسـولینی دوورگەی پەنکریاس[٢٦٥]، خۆڕانەگریی گلوکۆز[٢٦٦]، نوێ یان ئاڵۆزبوونی خۆڕانەگریی گلوکۆز دەبینرێ. ئێش و زۆرتر پشـتئێشـە کاتێک دەبینرێن کە تومۆر بە هۆی سـەرهەڵدانی لە جەسـتە یان کلکی پەنکریاس کارتێکەریی لەسـەر گانگلیۆنی سـیلیاک[٢٦٧] هەبووبێ. گیرانی ٦٠٪ی ڕێگەی سـیسـتەمی بۆریی پەنکریاس بە هۆی تومۆر دەبێتە هۆی سـەرهەڵدانی ناتەواویی ئیکزۆکرینی پەنکریاس[٢٦٨]. ناتەواویی ئینـدۆکرینی پەنکریـاس لە پێوەنـدی لەگەڵ پـانتـایی تومۆرەکەدایە. نیشـانەکانی دیکە بریتین لە ئانۆرکسـی (بێئیشـتیایی)[٢٦٩]، دابەزینی نـائـاسـایی قورسـایی لەش، مـاندوێتی و لاوازی، دڵتێکهەڵهـاتن و ڕشـانەوە، نیشـانەکانی ترومبۆفلیبیتی کۆچەر[٢٧٠] (نیشانەی ترۆسۆ[٢٧١])، پـانکراتیتی کتوپڕ، نەخۆشـیی شـەکرە، سـیندرۆمەکـانی پارانیۆپلاسـتیک[٢٧٢] (سـیندرۆمی کوشـینگ)، هیپێرکالسـیمی، خوێنبەربوونی دەزگای هەرسـکردن، ترۆمبۆزی خوێنهێنەری سـپڵ و دیاریکردنی تۆپەڵێکی نائاسـایی لە سک یان گەورەبوونی کیسەی زیل (نیشانەی کووروازیە[٢٧٣]) لە کاتی تێڕوانینی لەشدا.

---

265 Insulin – producing islet cells
266 Glucose intolerance
267 Celiac ganglia
268 Exocrine pancreatic insufficiency
269 Anorexia
270 Migrating thrombophlebitis
271 Trousseau's syndrome
272 Paraneoplastic syndrome
273 Courvoisier sign

## دیاریکردن

دەستنیشانکردنی شێرپەنجەی پەنکریاس لە زۆربەی بوارەکاندا بەپێی دیتنی تۆپەڵی نائاسایی پەنکریاسە لە کاتی وێنەگرتندا. **کامپیوتێرتوموگرافی** بە بەکارهێنانی مادەی ڕەنگی لە ٩٠٪ی بوارەکاندا بۆ دیاریکردنی تومۆری پەنکریاس هەستیارە[274]، بەڵام زۆر جار لە تومۆگرافیدا ئەو تومۆرانەی کە ئەندازەیان لە ٢ سانتیمەتر کەمترە، نابینرێن. هەستیاری **ئێندۆسۆنۆگرافی**[275] [ئیندسکۆپیک سۆنۆگرافی] بۆ دەستنیشانکردنی ئەو تومۆرانەی کە ئەندازەیان کەمتر لە ٢ سانتیمەتر بەرزترە و لەم کارەدا بەپێی پێداویستی، دەرفەت بۆ نموونەهەڵگرتنیش هەیە. هەروەها کامپیوتێرتومۆگرافی




کامپیوتیر توموگرافیی تووموری سەری پانکریاس(٣)، لەگەڵ خوینهینەری پورت(١) و پەنگخواردنەوەی زراو لە بۆریی زراوبەردا(٢). تووموری سەری پانکریاس هەتا دوازدەگری دریژوەی هەیە.

---

[274] Sensitive

[275] EUS - Endoscopic Ultrasound

ڕێ بە هەڵسەنگاندنی ڕادەی بڵاوبوونەوەی خۆجێیی و دووری تومۆر دەدا. شوێنی باو بۆ میتاستازی ڤاسکولار[٢٧٦] بریتییە لە: خوێنهێنەرەکانی پۆرتاڵ (دەرکەیی)[٢٧٧] و سپڵ، خوێنبەرەکانی مێزەنتەریکی سەروو و تەوەری سیلیاک. ئادنۆکارسینۆم زۆرتر لە ڕێگەی خوێنهێنەری پۆرتاڵ[٢٧٨] بۆ جگەر تەشەنە دەکا، هەرچەند بڵاوبوونەوەی تومۆر لە سییەکان و پریتۆنیاڵیش (پەردەی سک)دا باوە. بێگومان دیاریکردنی ئادنۆکارسینۆم لە ڕێگەی **نموونەهەڵگرتنەوەیە**. کاتێک بەپێی وێنەکان وێچوونی بڕین و لێکردنەوەی تومۆر هەبێ، ئیتر پێش ڕێزەکسیۆنی چاککەرەوە[٢٧٩] پێویست بە نموونەهەڵگرتن ناکا. **تاقیکردنەوەی نیشانەکەری تومۆر** وەکو CA19-9 لە خوێندا دەتوانێ پاڵپشتی دیاریکردن بێ، بەڵام ئەم نیشانەکەرە لە ڕوانگەی هەستیاری و تایبەتمەندییەوە[٢٨٠] قەت بەو ئەندازەیە نەبووە کە بۆ دیاریکردنی شێرپەنجەی پەنکریاس پشتی پێ ببەسترێ. لە ڕەوتی دیاریکردندا بەپێی ئیندیکاسیۆن دەکرێ کەڵک لە **وێناکردنی زرنگانەوەی موگناتیسی، کامپیوتێرتومۆگرافی بە دەردانی پۆزیترۆنەوە، لاپراسکۆپی، کلانژیوپانکراتۆگرافی ڕەترۆگراد ئیندەسکۆپیک**[٢٨١] (بۆ دیاریکردنی تەنگیی بۆریی سەرەکیی پەنکریاس)، **کامپیوتێرتومۆگرافیی سییەکان، وێنەگرتنی سییەکان بە یارمەتیی تیشکی ئیکس (بۆ دیاریکردنی میتاستاز) و سۆنۆگرافی لە ڕێگەی پێستەوە**[٢٨٢] وەربگیرێ. بەکارهێنانی کامپیوتێرتومۆگرافی و ئێندۆسۆنۆگرافی [کاتێک لە ڕێگەی تومۆگرافییەوە میتاستازەکان بە ئاشکرا دیاری نەکرێن] ئامرازێکی باشن بۆ قۆناخبەندیی شێرپەنجە.

---

[276]Vascular metastasis
[277]Splenic vein
[278] Portal vein
[279] Curative resection
[280]Specific
[281] Endoscopic retrograde cholangiopancreatography (ERCP)
[282] Transcutaneous ultrasonography (TUS).

## چارەسەر

نەشـتـەرگەری تەنها شـانس و شـێوەی چاککەرەوەی تومۆرێکە کە بۆ ڕێژەکســـیۆن دەبێ. چۆنێتی، چەشـــن و پانتایی نەشـــتەرگەری لە پێوەنـدی لەگەڵ شـــوێن و ئەنـدازەی تومۆردایە. بۆ وێنە، بۆ بڕین و لابردنی تومۆر لە سـەری پەنکریاس یان ناوچەی دەوری ئەمپوول[٢٨٣]، هەروەها بۆ تومۆرەکانی بۆریی پەنکریاس[٢٨٤] کۆلانژیوکارســـینۆم[٢٨٥] (شـــێرپەنجەی بۆریی زراو[٢٨٦]) و تومۆرەکـانی دوازدەگرێ کەڵک لە نەشـــتەرگەریی ویپل[٢٨٧] (پانکریاتیکۆدیودینێەکتۆمی)[٢٨٨] وەردەگیرێ. لەم نەشـتەرگەرییەدا تەواوی سـەری پەنکریاس، دوازدەگرێ، کیسـەی زیلک و بەشـــی ئانترۆمی گەدە لادەبەن و زۆر جار درێناژی بەشـــی دیســـتـالی بۆریی پەنکریـاس[٢٨٩] و دەزگـای زراوی[٢٩٠] لە ڕێگـەی ئاناســـتۆمۆز لەگەڵ ژیونۆمەوەیە. هۆی لابردنی ئەو هەموو پێکهاتەیە پێکەوە، هەبوونی ســـەرچاوەی هاوبەشـــی ڕەوتی خوێنگەیشـــتنیانە. جـاروبـار نەشـــتەرگەر لە کـاتی نەشـــتەرگەریدا بۆ کەمکردنەوەی ئـاڵۆزییەکـانی نەشـــتەرگەری، پـاراســـتنی تـان و پۆی ســـاغ و کەمکردنەوەی کـاتی دەرمـان و ســـاڕێژبوونەوە، هـاوکـات کەڵک لە تـیشـــکـدەرمـانـی[٢٩١] وەردەگـرێ. ڕێـژەی مـردن بە هـۆی پانکریاتیکۆدیودینێەکتۆمی لە هەموو شوێنەکاندا ٦,٦٪ بووە.

---

[283] Periampullary region
[284] Pancreatic ductal tumors,
[285] Cholangiocarcinoma
[286] Bile duct cancer
[287] Whipple
[288] Pancreaticoduodenectomy
[289] Distal pancreatic duct
[290] Biliary system
[291] Intraoperative radiation therapy (IORT)



سەرهەڵدانی هاوکاتی شێرپەنجەی گەدە و پەنکریاس

بۆ تومۆرەکانی جەستە و کلکی پەنکریاس کەڵک لە دیستال پانکراتئەکتۆمی[٢٩٢] وەردەگرن. لەم نەشتەرگەرییەدا، بە بەراورد لەگەڵ نەشتەرگەریی ویپل، ڕێژەی مردن کەمترە (٣,٥٪)، بەڵام بەکارهێنانی ئەم شێوەیە وەکو ڕیزەکسیۆنی چاککەرەوە بەستراوەیە و بە داخەوە تومۆرەکانی جەستە و کلکی پەنکریاس بە هۆی سەرهەڵدانی درەنگوەخت زۆر جار ئیتر بۆ ڕیزەکسیۆن نابن. کاتێک شوێنی سەرهەڵدانی تومۆر ملی پەنکریاس[٢٩٣] بێ، تۆتال پانکراتئەکتۆمی[٢٩٤] ئیندیکاسیۆنی هەیە، سەرەڕای ئەوەی کە ئەم چەشنە نەشتەرگەرییە بە بەراورد لەگەڵ شێوەکانی دیکەی نەشتەرگەری کەمتر باوە و هۆی بەرزبوونەوەی ڕێژەی مردنە (٨,٣٪)، لەوە دەچێ ئێستاش شێوەیەکی بەکەڵک بێ بۆ دەرمانکردنی شێرپەنجەی پەنکریاس. کاتێک بە هۆی تەشەنەی تومۆر بۆ ڕەگە گرینگەکان وەکو خوێنبەری مێزەنتەریکی سەروو و جەستەی سیلیاک[٢٩٥] دەرەتانی نەشتەرگەری نەبێ، پێویست

---

292 Distal Pancreatectomy
293 Neck of the pancreas
294 Total Pancreatectomy
295 Celiac trunk

به شـــیمۆ و ڕادیاســـیۆنتراپی پێکەوە وەکو تراپیی یەکجاری یان بۆ پێکهێنانی دەرفەتی نەشـــتەرگەرییە. لەو کەســـانەدا کە شـــێرپەنجەی پەنکریـاســـیـان لە ڕێگـەی نەشـــتەرگەرییەوە بە تەواوی لابراوە، بیروڕایەکی هاوبەش سـەبارەت بە دەرمانی پاش نەشـتەرگەری نییە و بە هۆی ئاکامی لێکدژی لێکۆڵینەوەکان، پێویســتە هەڵبژاردنی شـێوەی دەرمان بەپێی تایبەتمەندییەکانی نەخۆش بێ. گێمسـیتابین[٢٩٦] دەرمانی سـتانداردە بۆ زۆربەی شێرپەنجەکانی میتاسـتاتیکی پەنکریاس. پێدانی کۆی گێمسیتابین و سیزپلاتین یان ئۆکسالیپلاتین ڕادەی کاردانەوە[٢٩٧] بەرز دەکـەنەوە. "تـاقیکردنەوەکـانی بەهەڵکەوت کۆنترۆڵکراو"[٢٩٨] نیشـــاندەری بەرزکردنەوەی مـامنـاوەنـدیی زینـدوومـانەوەی ئەو نەخۆشـــانەن کە بە جێگەی مۆنۆتراپی بە گیســـتـامین، بە کۆی گێمســـیتابین و ئێرلۆتنیب[٢٩٩] لە ڕێگەی خواردنەوە چارەســـەر کراون. لەم دواییانەدا "تـاقیکردنەوەکانی بەهەڵکەوت کۆنترۆڵکراو" لە پێوەندی لەگەڵ پێـدانی 5-FU، لەیکۆورین، ئیرینۆتیســـــان و ئۆکســـیپلاتین (FOLFIRINOX) بە بەراورد لەگەڵ پێـدانی گێمســـیتـابین بە تەنهـا نیشـانیان داوە کە سەرەڕای کاریگەریی ژەهراویی ئەم پێکهاتەیە (واتە FOLFIRINOX)، مـامنـاوەنـدیی کـاتی زینـدوومـانەوەیـان بە ڕێز ١٠،٥ مانگ لە بەرامبەر بە ٦،٩ مانگ بووە.

---

[296] Gemcitabine

[297] Response rate

[298] Randomized controlled trial

[299] Erlotinib

## چەند نموونەیەک لە پرۆتۆکۆلی دەرمانی شێرپەنجەی پەنکریاس پێشنیاز بۆ دەرمانی تومۆری خۆجێیی کە بۆ نەشتەرگەری دەبن قۆناخی I و II

### دەرمانی یاریدەدەری نوێ

* ئێستا (بە گشتی) ڕێژیمێکی ستانداردی یاریدەدەری نوێ بۆ دەرمانی ئەو تومۆرانەی کە بۆ نەشتەرگەری دەبن، نییە.

* پێویستە تراپیی یاریدەدەری نوێ لەسەر بنەمای لێکۆڵینەوەیەکی کلینیکی بۆ ئەو نەخۆشانە بێ کە تومۆرەکەیان لە ڕێگەی نەشتەرگەرییەوە لادەبرێ.

* نموونەیەک لە خشتەی دەرمانی یاریدەدەر بریتییە لە کاپیسیتابین، فلوۆرۆئوراسیل، یان فلوۆرۆئوراسیل/سیزپلاتین لەگەڵ ڕادیاسیۆن، یان ئیندوکسیۆن تراپی[٣٠٠] لەگەڵ گێمیستابین یان گێمیستابین/سیزپلاتین.

### شیمۆتراپیی یاریدەدەر بۆ شێرپەنجەی پەنکریاس

* کاتێک دەرەتانی نەشتەرگەری هەبێ، تراپیی یاریدەدەر لەگەڵ گێمسیتابین لە حاڵەتی مۆنۆتراپی (تاکدەرمانی) (CONKO-001 tria) ئیندیکاسیۆنی هەیە.

* گێمسیتابین $1000\ mg/m^2$ IV لە درێژایی ٣٠ خولەکدا، جارێک لە حەوتوو بۆ ماوەی ٣ حەوتوو؛ هەر ٤ حەوتوو [هەتا ٦ خول (سیکل)].

---

[300] Induction therapy

**شیمۆدەرمانیی یاریدەدەر و شیمۆڕادیاسیۆن بۆ شێرپەنجەی پەنکریاس**

* گێمســـیتابین 1000 mg/m$^2$ IV لە درێژایی ۳۰ خولەکدا، جارێک لە حەوتوو بۆ ماوەی ۳ حەوتوو.

* دەســتپێکی شــیمۆڕادیاســیۆن یەک هەتا دوو حەوتوو پاش پێدانی گێمســـیتـابین: لە کـاتی ڕادیـاســـیۆنـدا ئینفیوژنی بەردەوامی ٥-فلوۆرۆئوراسیل 250 mg/m2/day لە ڕێگەی پۆمپەوە[٣٠١].

* ڕادیۆتراپی بە وزەی ۱۸ گرێی لە ڕۆژ هەتا ٥٠،٤ گرێی بە گشــتی، **پاشــان** ســێ هەتا ٥ حەوتوو پاش شـیمۆڕادیاسـیۆن: گێمسـیتابین 1000 mg/m$^2$ IV جارێک لە حەوتوو لە درێژایی ۳۰ خولەکدا؛ هەر ۲۸ ڕۆژ بۆ سێ خول.

* دەکرێ پاش ڕژیمی سەرەوە بۆ ماوەی ٥ هەتا ٦ حەوتوو لەگەڵ ڕادیاسیۆن هاوکات کاپیسیتابین 800-900 mg/m$^2$ PO BID بە نەخۆش بدرێ.

**پێشنیاز بۆ دەرمانی تومۆری خۆجێیی پەرەگرتوو کە بۆ نەشتەرگەری نابێ قۆناخی III:**

**دەرمانی یاریدەدەری نوێ:**

* گێمســـــیتابین 1000mg/m$^2$ IV لە درێژایی ۳۰ خولەکدا جارێک لە حەوتوو، بۆ ماوەی سێ حەوتوو؛ هەر ۲۸ ڕۆژ **یان**

* ٥-فلوۆرۆئوراســـیـل 500 mg/m$^2$/day IV بە چەشـــنی بۆلوس لە ڕۆژەکانی ۱ هەتا ۳ و ۲۹ هەتا ۳۱ هاوکات لەگەڵ ڕادیۆتراپی ٤٠ گرێیی.

ئـامـانجی تراپی لەو نەخۆشـــانەی کە تومۆری پەنکریـاســـیـان نەشتەرگەری نەکراوە، سـوکنایی نیشـانە سەرەکییەکانی وەکو ئێش و زەردوویی لە ڕێگــەی پێـدانی ئێشـــبرەکـان، دابینکردنی فەنەری ترانســـپاپیلار[٣٠٢]، هەروەها گاســـترۆئێنترۆســـتۆمییە لە کاتی گیرانی ڕەوگەی بەرەو دەرەوەی گەدە[٣٠٣].

---

301 Pump

302 Transpapillary stenting

303 Gastric outlet obstruction

## دوابینی

تەنها لە نزیکەی ١٥٪ی بوارەکاندا شــێرپەنجەی پەنکریاس لە ڕێگەی نەشــتەرگەریی ڕادیکاڵەوە، واتە R0، لادەبرێ. ٤٠٪ی نەخۆشــەکان لە درێژایی ٣ مـانگی هەوەڵ، ٦٥٪ لە درێژایی ٦ مـانگی هەوەڵ و لە ٩٠٪ لە درێژایی یەک ســـاڵی پاش دیاریکردنی شــێرپەنجەدا دەمرن. هۆیە سـەرەکییەکانی مردن بریتین لە ناتەواویی جگەر، سـێپسـیس، هەروەها کاشـێکســی و لاوازی و بێهێزی. وێچوونی زیندوومانەوە بۆ ماوەی ٥ ســـاڵ لە کاتی ڕێزەکســـیۆنی تومۆر لە قۆنـاخی T1N0M0دا ٤٠٪ە. تەشـــەنەی تومۆر بۆ لیمفەگرێکـان دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ئەم ڕێژەیە.

### کورتەیەک سەبارەت بە تومۆرە نورۆئیندۆکرینییەکانی پەنکریاس[٣٠٤]

تان و پۆی نێوەڕژێنی پەنکریاس ســەرچاوەی ســـەرهەڵدانی تومۆرە نورۆئێندۆکرینییەکانی پەنکریاس و هۆی بەرزبوونی ڕێژەی دەلاندنی هورمۆنەکانە. هەروەهـا تومۆرەکـانی نورۆئێندۆکرین لە بەشــــەکـانی دیکەی سـیسـتەمی گەدەیی ڕیخۆڵەییەوە سـەرچاوە دەگرن. هەروەها ئەم تومۆرانە لە پێوەندی لەگەڵ فرەنیۆپلازیی نێوەڕژێن لە چەشــــنی یەک (MEN-1)[٣٠٥] و نەخۆشـیی هیپل–لینداون[٣٠٦]. لە خشـتەی خوارێدا تایبەتمەندییە کلینیکییەکانی تومۆرەکانی نورۆئێندۆکرین نیشان دراون. **گاسترینۆما**[٣٠٧] باوترین چەشنی تومۆری نورۆئێندۆکرین و هۆی زێدە دروســتبوونی گاســترین و چوونەوەســەرەوەی چەندێتی و چالاکیی خـانەکانی پاریتـال (دیوارەیی) و زێدەدەلاندنی[٣٠٨] ئەســـیدی گەدەیە. شـــوێنەکـانی ســـەرهەڵدانی گـاســـترینۆمـا بریتین لە: پەنکریـاس،

---

[304] Pancreatic Neuroendocrine Tumors (Islet cell tumors)
[305] Multiple endocrine neolasia type 1
[306] Hippwl-Lindau disease
[307] Gastrinoma
[308] Hypersecretion

دوازدەگرێ، ئانترۆم و لیگامێنتۆمی هێپاتۆدیودینال[309]. لە ٤٠٪ هەتا ٥٠٪ی نەخۆشـەکاندا گاسـترینۆما لە دیواری دوازدەگرێدا دیتراوە. لە ٦٠٪ هەتـا ٧٠٪ی بوارەکـاندا گـاسـترینۆمـا لە چەشـنی تومۆری مەترسـیدارە و کاتی دەسـتنیشـانکردنی لە ٥٠٪ی بوارەکاندا بۆ لیمفەگرێ نـاوچەییەکـان و جگەر تەشـەنەی کردووە. لە چواریەکی بوارەکاندا گاسـترینۆما لە پێوەندی لەگەڵ فرەنیۆپلازیی نیۆەڕژێن لە چەشـنی یەک و هیپێرپـاراتیرۆیـدیسـم و تومۆری هیپۆفیزدایە. زێدەدەڵاندنی ئەسـید دەبێتە هۆی زامی ئەندامەکانی بەشـی سـەرووی سیستەمی گەدەیی ڕیخۆڵەیی. سەرهەڵدانی بەردەوامی برین لە شوێنی نـاتـایبەتمەنـد لـە (٩٥٪) لە گەدە، دوازدەگرێ و تەنـانەت ژێژیونوم، سـکەشـۆرە (لـە ٥٠٪ی بوارەکـاندا) و پیسـایی چەور بە هۆی کەمکردنەوەی چالاکیی لیپاز وەکو ئاکامی کاریگەریی ئەسـیدی گەدە لە نیشـانەکانی ئەم تومۆرەن. لە کاتی دیاریکردنی ئەم نەخۆشـییەدا پێویسـت بە تاقیکردنەوەی گاسـترینی خوێن و بزوێنەوەی سـکرێتین هەیە. سـینتیگرافیی وەرگرەکانی سـۆماتۆسـتاتین[310]، ئێندۆسـۆنۆگرافی، کامپیوتێرتومۆگرافی و وێناکردنی زرنگانەوەی موگناتیسـی، هەروەها ئێندسـکۆپی یـارمـەتیی دیـاریکردنی شـوێنی تومۆر دەدەن. کاتێک گاسـترینۆما حاڵەتی نەخۆشـیی خۆجێیی[311] بێ، برین و لابردنی ئەم تومۆرە دەبێتە هۆی چارەسـەری یەکجاری بەبێ سـەرهەڵدانەوەی تومۆر لە ٢٠٪ هەتا ٢٥٪ی نەخۆشەکاندا. بەپێی ڕاپۆرتە پزیشکییەکان، نەشتەرگەریی ویپل (پانکریاتیکۆدیودینێکتۆمی)، بە تایبەتی لە حاڵەتی فرەنیۆپلازیی نیۆەڕژێن لە چەشـنی یەکدا ئاکامی باشـی هەبووە. هەروەها لەم شـێوە نەشـتەرگەرییەدا بۆ چارەسـەری تومۆرەکانی سـپۆرادیـک کەڵـک وەردەگیرێ. بۆ دەرمـانی برینی پێپتیـک و کەمکردنەوەی ئەسیدی گەدە، کەڵک لە بەرهەڵستکاریی کاناڵی پرۆتۆن

---

[309] Hepatoduodenal ligament

[310] Somatostatin receptor scintigraphy (SRS)

[311] Localized disease

وەکو نەکســـيۆم، ئۆميپرازۆل و هتــد... وەردەگيرێ. ئۆکتريۆتيـد[٣١٢] دەرمانێکی شياوە بۆ پێشگيری لە سکەشۆرە. بۆ ئەو نەخۆشانەی کە تووشــی نەخۆشـيی ميتاســتاتيک[٣١٣] بوون و ويچوونی نەشـتەرگەری لەواندا نييە، کەڵک لە شـيمۆدەرمانی (بۆ وێنە، کۆی سـتريپتۆزۆسـين، فلوئۆراسـيلی ٥ و دۆکسـۆروبيسـين) وەردەگيرێ. شـيمۆدەرمانی بۆ ئەو کەســـانەی کە لەواندا نەخۆشـــيی ميتاســـتاتيک لە ليمفەگرێکاندا قەتيس ماوەتەوە، ئينديکاسيۆنی نييە.

## خشتەی تومۆرە نورۆئيندۆکرينييەکانی پەنکرياس

| چەشنی تومۆر | هۆرمۆن | نيشانەکان | دياريکردن |
|---|---|---|---|
| گاسترينۆما | گاسترين | ئولسيری پيپتيدی[٣١٤]، سکەشۆرە، هەوی سورينچک، (سيندرۆميزۆلينگير ئيلسۆن[٣١٥]) | بەرزبوونەوەی گاسترينی خوێن سەرەوەی ١٠٠٠ پيکتۆگرام لە ليتردا، تاقيکردنەوەی بزوێنەوەی سکريتين[٣١٦] |

---

312 Octrotide
313 Metastatic disease
314 Peptic ulcers
315 Zollinger-Ellison syndrome
316 Secretin stimulation tesct

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئینسولینوما[٣١٧] | ئینسولین | هیپۆگلیسیمی: لە پێوەندی لەگەڵ MEN-1 | بەرزبوونەوەی نەگونجاوی ڕێژەی ئینسولین لە کاتی هیپۆگلیسیمییدا |
| سیندرۆمی ڤێرنێرمۆریسۆن[٣١٨] | پێپتید وازوئاکتیڤی ڕیخۆڵەیی[٣١٩] | سکەشۆرەی ئاوەکی، هیپۆکالیمی، هیپۆکلۆرهیدری[٣٢٠] | بەرزبوونەوەی ڕادەی پێپتید وازوئاکتیڤی ڕیخۆڵەیی سەرەوەی ٧٥ پێکتۆگرام لە لیتردا |
| گلوکاگۆنوما[٣٢١] | گلوکاگۆن | هەوی پێست[٣٢٢]، نەخۆشیی شەکرە | بەرزبوونەوەی گلوکاگۆنی خوێن بۆ سەرەوەی ١٠٠٠ نانۆگرام لە لیتردا |

317 Insulinoma
318 Verner-Morrison-Syndrom
319 Vasoactive intestinal peptide
320 Hypochlorhydria
321 Glucagonoma
322 Dermatitis

**ئینسولینۆما** باوترین هۆی هیپۆگلیسیمیی وەکو ئاکامی هیپێرئینسولینیسمی ئێندۆژێنیکە[323]. لە نزیکەی ٩٠٪ هەتا ٩٥٪ی بوارەکاندا ئینسولینۆما لە چەشنی بێمەترسی (بێوەی) و ١٠٪ی لە چەشنی مەترسیدارە. ڕادەی سەرهەڵدانی لە نێوان پیاو و ژندا ٢ بە ٣یە. زانیارییەکی ورد سەبارەت بە ڕێژەی سەرهەڵدانی لە ئاستی جیهاندا لە بەردەستدا نییە، بەڵام بەپێی بەشێک لە لێکۆڵینەوەکان، ڕادەی سەرهەڵدانی ساڵانەی لە باکووری ئێرلەند ١ لە هەر ١٠٠٠٠٠٠ کەسە. بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی زانستگای تاران کە لە ساڵی ٢٠٠٥دا بڵاو بووەتەوە، ٦٨ نەخۆشی ئینسولینۆما لە ماوەی ٢٠ ساڵدا تومار کراون. لە ئەمەریکا ئینسولینۆما باوترین تومۆری نیوەڕژێنی پەنکریاسە و ڕادەی سەرهەڵدانی ساڵانەی ٣ هەتا ١٠ لە هەر ١٠٠٠٠٠٠ کەسدایە و ٥٥٪ی تەواوی تومۆرەکانی نورۆئێندۆکرین لە خۆ دەگرێ. نیشانەکانی ئینسولینۆما لە کاتی دابەزینی شەکری خوێن بۆ خوارەوەی ٤٥ میلیگرام لە دسیلیتردا دەردەکەون، ئەم نیشانانە بریتین لە: ئارەقەکردن، تاکیکاردی، هەستکردن بە گەرمداهاتنی لەش، دڵەکوتە، لەرز، بێهێزبوون. ترس، برسێتی، دڵتێکهەڵهاتن، سەرەگێژە، سەرئێشە، سەرلێشێواوی، گیران یان گرژیی ماسوولکەکان، توندوتیژی، پاراستێزی و ئافازی و... پێدانی گلوکۆز دەبێتە هۆی لەبەینچوونی ئەم نیشانانە. بەرزبوونەوەی نەگونجاوی ڕێژەی ئینسولین لە کاتی هیپۆگلیسیمیدا (لە کاتی برسیڕاگرتنی نەخۆش بۆ ماوەی ٧٢ کاژێردا) نیشاندەری ئینسولینۆمایە. ئێندۆسۆنۆگرافی، کامپیوتێرتومۆگرافی و وێناکردنی زرنگانەوەی موگناتیسی بە بەکارهێنانی گادۆلینیوم[324] و سینتیگرافیی وەرگرەکانی سۆماتۆستاتین

---

[323] Endogenous hyperinsulinism
[324] Gadolinium

یارمەتیی دیاریکردنی ئینسولینۆما دەدەن. شێوەی هەڵبژاردە بۆ دەرمانی ئینسولینۆما نەشتەرگەرییە. بۆ ئەم مەبەستە کەڵک لە شێوەگەلی جۆراوجۆر وەکو نەشتەرگەری لاپرۆسکۆپیک، بڕین و دەرهێنانی تومۆر (ئینوکلیاتسیۆن[325])، پانکریاتیک ودیۆدینێئەکتۆمی (کاتێک دەرەتانی ئینوکلیاسیۆن نەبێ)، نەشتەرگەری ویپل (کاتێک شوێنی تومۆر لە سەری پەنکریاس بێ و دەرەتانی بڕین و دەرهێنانی خۆجێی[326] نەبێ) و سوبتۆتال پانکریاتێئەکتۆمی لەگەڵ ئینوکلیاسیۆن (کاتێک ئینسولینۆما لە پێوەندی لەگەڵ MEN1 بێ)، وەردەگیرێ. بۆ پێشگیری لە سەرهەڵدانی هیپۆگلیسیمی و کەمکردنەوەی سنووری تومۆر لەوانەی کە تووشی تومۆری مەترسیدار بوون، کەڵک لەم دەوایانە وەردەگیرێ:

* **دیازۆکسید**[327] بۆ کەمکردنەوەی دەڵانی ئینسولین.
* **هیدرۆکلۆرۆتیازید**[328] بۆ پێشگیری لە هەڵماسین[329] و هیپێرکالێمی بە هۆی کاریگەریی دیازوکسید.
* **ئۆکتریۆتید** بۆ پێشگیری لە سەرهەڵدانی هیپۆگلیسمی.

**سیندرۆمی ڤێرنێر- مۆریسۆن** بە دەگمەن دەبینرێ، ئەم تومۆرانە بەپێی دەڵاندنی پیپتید وازۆئاکتیڤی ڕیخۆڵەیی دەبنە هۆی سەرهەڵدانی نیشانەگەلێکی وەکو: سکەشۆرەی ئاوەکی، هیپۆکالێمی، هیپۆ یاخود ئاکلۆرهیدری، هەروەها سەرهەڵدانی نەخۆشیی شەکرە، دابەزینی نائاسایی قورسایی لەش، قوڵنجی سک و سەرلێشێوان. سەرەڕای

325Enucleation
326Local excision
327 Diazoxide
328Hydrochlorothiazide
329Edema

ئەوە کە لوتکەی سەرهەڵدانی ئەم تومۆرە دەیەی پێنجەمی ژیانی نەخۆشە، وێچوونی سەرهەڵدانی لە هەر تەمەنێکدا هەیە. لە تاقیکردنەوەی خوێندا ڕادەی VIP ٢ هەتا ١٠ کەڕەت لە سەرەوەی حاڵەتی ئاساییە (نۆرماڵ: 20-30 pmol/L). لێکۆڵینەوەکانی وێنەگری زۆرتر لە پێوەندی لەگەڵ پەنکریاسدان کە لە ٩٠٪ی بوارەکاندا ئەم تومۆرانە لەوێ جێگیر بوون. دیاریکردنی شوێنی تومۆر، بە هۆی ئەوەی کە لە کاتی دەستنیشانکردنیدا ئەندازەی سەرەوەی ٣ سانتیمەترە، کارێکی هاسانە. ئێندۆسونۆگرافی، کامپیوتێرتومۆگرافی و وێناکردنی زرنگانەوەی موگناتیسی، هەروەها سینتیگرافیی وەرگرەکانی سۆماتۆستاتین یاریدەی دیاریکردنی ئەم تومۆرە دەدەن. ئەم تومۆرە زۆرتر تەشەنە بۆ جگەر یان لیمفەگرێ ناوچەییەکان دەکا. بە دەگمەن تەشەنەی ئەم تومۆرانە بۆ پێست ڕاگەیەنراوە. نەشتەرگەریی تومۆری خۆجێیی چارەسەری هەڵبژاردەیە. کاتێک شوێنی سەرهەڵدانی تومۆر سەری پەنکریاس یان processus uncinatus بێ، پانکریاتیکۆدیۆدێنێکتۆمی ئێندیکاسیۆنی هەیە. کاتێک لە کاتی نەشتەرگەریدا تومۆر دیاری نەکرێ، لەوە دەچێ پێویست بە بڕین و جیاکردنەوەی کلکی پەنکریاس[330] بێ. لە مێژە ئیتر توتالپانکریاتێکتۆمی پێشنیاز ناکرێ. سەعاتێک پاش چارەسەری چاککەرەوە، ڕێژەی VIP دەگەڕێتەوە حاڵەتی ئاسایی. لەم نەخۆشانەدا بەکارهێنانی ئۆکتریۆتید لە ٩٠٪ی بوارەکاندا یاریدەی کۆنترۆڵکردنی سکەشۆرە دەدا و گلوکۆکۆرتیکۆیدەکان لە ٥٠٪ی بوارەکاندا دەبنە هۆی باشترکردنی نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە. شیمۆتراپی سیستەمیک (بە بەکارهێنانی ستریپتۆزۆسین، دۆکسۆروبیسین، فلۆرۆئوراسیل یان

[330] Pancreatic tail

هەموو ئەوانە) بۆ ئەو کەســـانەی ئیندیکاســـیۆنیان هەیە کە ویچوونی نەشتەرگەری لەواندا نییە یاخود نەخۆشییەکە پەرەی سەندووە.

**گلوکـاگۆنۆمـا** تومۆرێکی دەگمەن و مەترســـیداری خـانەکـانی Aی پـەنکریاســــە. ئەم تومۆرە نزیکەی ١٪ تومۆرەکانی نورۆئیندۆکرین لە خۆ دەگرێ. لە نێوان سـاڵی ١٩٤٢ی زایینی هەتا سەرەتای سەدەی ٢١ لە ســەرچاوە پزیشــکییەکانی جیهاندا باســی نزیکەی ٢٥٠ نەخۆشــی گلوکـاگۆنۆمـا کراوە. نیشـــانەکانی ئەم نەخۆشـــییە بریتین لە هەوی پێســتی دەموچاو، بەرزبوونەوەی شــەکری خوێن، دابەزینی نائاسـایی قورسـایی لەش، سـکەشـۆرە و هەوی دەم[٣٣١]. لە تاقیکردنەوەی خوێندا بەرزبوونەوەی گلوکـاگۆنی خوێن بۆ ســــەرەوەی ١٠٠٠ نـانۆگرام لە لیـتردا دەبینرێ. کــامپیوتیرتومۆگرافی و وێنــاکردنی زرنگــانەوەی موگناتیســـی یاریدەی دیاریکردنی شـــوێنی ئەم تومۆرە دەدەن. لەوە دەچی بەشـێک لە دەواکان ببنە هۆی پاشــەکشــەی بەشـێکی[٣٣٢] تومۆر یان باشــترکردنی نیشــانەکانی. لە ســەرچاوەکاندا باســی کاریگەریی بــاشـــی دۆکســـۆروبیســـین و ســـتریپتۆزۆتۆســـین، هەروەهـا فلوئۆرۆئوراســـیلی ٥ کراوە. نەشـــــتەرگەریی تومۆر تەنهـا ڕێگەی چارەسەری ئەم نەخۆشییەیە.

---

[331]Stomatitis
[332]Partial regression

# سەرچاوەكان

1- Richard S. Eisenstaedt, MD, FACP: Profesor of Medicine &..... MKSAP Pancreatic Cancer, p. 81-82, Hematology and Oncology 2015, ACP, USA

2- Amy S. Oxentenko, MD, FACP, Editor, Assistant Professor of Medicine& ... MKSAP 16 Pancreatic Adenocarcinoma& Pancreatic Neuroendocrine Tumors p. 26-2729, Gastroenterology and Hepatology. 2015, ACP, USA

3- Thomas E. Andreoli/ Ivor J. Benjamin & ....Andreli and Carpenter's CECIL Essentials of Medicine, 8th edition 2010

4- Gerd Herold und Mitarbeiter, Pankreaskarzinom, Innere Medizin, Köln 2015

5- Tomislav Dragovich, MD, PhD: Chief Editor: Jules E Harris, MD more... Pancreatic cancer, Updated: Oct 08, 2014, http://emedicine.medscape.com/article/280605-overview

6- Tomislav Dragovich, MD, PhD: Chief Editor: Jules E Harris, MD more... Pancreatic Cancer Staging, Updated: Sep 10, 2013, http://emedicine.medscape.com/article/2007121-overview

7- Vinay Kumar Kapoor, MBBS, MS: Chief Editor: Thomas R Gest, PhD more..., Pancreas Anatomy, Updated: Mar 22, 2013, http://emedicine.medscape.com/article/1948885-overview

8- Tomislav Dragovich, MD, PhD: Chief Editor: Jules E Harris, MD more..., Pancreatic Cancer Treatment Protocols, Updated: Sep 07, 2013, http://emedicine.medscape.com/article/2007067-overview

9- P. G Lankisch, Pankreas, Duktales Adenkarzinom, Gastroenterologie compact. Alles für Klinik und Praxis, Prof. Dr. med. Karlheinz Beckh, Thema, 2013

10- Jennifer Lynn Bonheur, MD: Chief Editor: BS Anand, MD more...Gastrinoma Treatment & Management. Updated: Dec 14, 2014, http://emedicine.medscape.com/article/184332-overview

11- Zonera Ashraf Ali, MBBS: Chief Editor: Jules E Harris, MD, FACP, FRCPC more...Insulinoma, Updated: Mar 03, 2015, http://emedicine.medscape.com/article/283039-overview

12- Sai-Ching Jim Yeung, MD, PhD, FACP: Chief Editor: George T Griffing, MD more...VIPomas, Updated: Jun 02, 2014, http://emedicine.medscape.com/article/125910-overview

13- Luigi Santacroce, MD: Chief Editor: George T Griffing, MD more...Glucagonoma, Updated: May 14, 2015, http://emedicine.medscape.com/article/118899-overview

# بەشی چوارەم

## شێرپەنجەی خانەی جگەر[333]
## پەتاناسی

شـێرپەنجەی خانەی جگەر لە پلەی حەوتەمین شـێرپەنجەی پیاوان و نۆیەمین شێرپەنجەی ژناندایە، هەروەها سێیەمین هۆی مردنە بە هۆی شێرپەنجەوە لە گشت جیهاندا. ڕادەی سەهەڵدانی ئەم شێرپەنجەیە لە وڵاتەکانی لە حاڵی پەرەســەندندا پتر لە دوو هێندە بەرزترە لە وڵاتانی پەرەسـەندوو. سـاڵی ٢٠٠٨ نزیکەی ٧٤٨٠٠٠ نەخۆشـی تازەتووشـبوو دیـاری کراون و ٦٩٦٠٠٠ کەس بەم هۆیە مردوون، ئەمە لە حـاڵێکدایە کە لە ســـاڵی ٢٠٠٢دا ڕیزی ئەم ڕێژەیە ٦٢٦٠٠٠ نەخـۆشـــی تازەدیاریکراو و ٥٩٨٠٠٠ مردن بە هۆی شـێرپەنجەی جگەرەوە بووە. ٨٠٪ی شـوێنی سـەرهەڵدانی شـێرپەنجەی خانەی جگەر لە وڵاتانی لە حـاڵی پەرەســـەنـدنـدا وەکو ئەفریقـای ڕەش[334] (ئەو وڵاتـانەی کە لە بـاشـــووری چۆڵگە [بیـابـان]ی گەورەی ئەفریقـادان)، بـاشـــووری

---

333 Hepatocellular Carcinoma
334 Sub-Saharan Afric

ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و ڕۆژهەلاتی ئاسیا وەکو چین، تایوان، کۆریا و مەغۆلستانە. ڕێژەی سەرهەڵدانی شێرپەنجەی خانەی جگەر لە وڵاتە ڕۆژئاواییەکان بەرز بووەتەوە. لەوە دەچێ ئاستی نزمی سیستەمی تەندروستی هۆی ڕێژەی سەرەوەی ئەم شێرپەنجەیە بێ لە بەشێک لە وڵاتانی ئاسیایی و ئەفریقاییدا، بەڵام لە وڵاتانی ڕۆژئاوایی زۆرتر پێوەندی بە پەرەسەندنی سیرۆز (لە ٨٠٪ی بوارەکاندا شێرپەنجەی خانەی جگەر لە نەخۆشەکانی سیرۆزدا سەرهەڵدەدات) و کاریگەریی ڤایرۆسی هێپاتیتی C و B، زۆرخواردنەوەی ئەلکول، هەروەها کارتێکەریی ئافلاتۆکسین[٣٣٥] بێ. سەرهەڵدانی شێرپەنجەی خانەی جگەر پێوەندی ڕاستەوخۆی لەگەڵ چوونەسەرەوەی تەمەن هەیە و ئەم ڕێژەیە لە وڵاتە جۆراوجۆرەکان تا ڕادەیەکی زۆر جیاوازە. لەو شوێنانە کە ڕێژەی سەرهەڵدانی ئەم شێرپەنجەیە بەرزە، شێرپەنجەی خانەی جگەر زۆرتر لە نێو جحێڵەکاندا دەبینرێ، بە پێچەوانەوە، لەو شوێنانەی کە ئەم ڕێژەیە نزمترە، ئەم شێرپەنجەیە زۆرتر لە نێو خەڵکی بەتەمەندا سەرهەڵدەدا. مەترسیی سەرهەڵدانی شێرپەنجەی خانەی جگەر لە پیاواندا بە بەراورد لەگەڵ ژنان ٢ هەتا ٧ کەرەت بەرزترە، ئەم ڕێژەیە دەشێ لە بەشێک لە وڵاتەکانی جیهاندا جیاواز بێ. لەوە دەچێ هۆی جیاوازی لە سەرهەڵدانی ئەم شێرپەنجەیەدا بەپێی ڕەگەز لە پێوەندیی بەم خاڵانەوە هەبێ:

* پیاوان بە بەراورد لەگەڵ ژنان زۆرتر لەژێر کاریگەریی کارسینۆژێنەکانی وەکو جگەرە، ئەلکول و نەخۆشیی هێپاتیتن.

* تێستۆسترۆن لە ڕێگەی وروژاندنی وەرگرەکانی ئاندرۆژێن لە پیاواندا دەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی پرۆلیفراسیۆنی خانەکانی جگەر.

---

335 Aflatoxin

## هۆ و فاکتەرە مەترسدارەکان

لە ٨٠٪ی بوارەکاندا شـــێرپەنجەی خـانەی جگـەر لە نەخۆشـــیی سیرۆزەوە سەرهەڵدەدا. فاکتەرە سەرەکییە مەترسیدارەکان بریتین لە: پیاوبوون، هێپاتیتی درێژخایەنی B و C، هیمۆکرۆماتۆز و کەمایەسیی ئالفا یەک ئانتیتریپسین، هەروەها زۆرخواردنەوەی ئەلکول، کاریگەریی ئافلاتۆکســین، دەواگەلێک وەکو دەوای پێشــگیری لە ســکپڕبوون[٣٣٦]، ئـانـدرۆژێن[٣٣٧]، ئـانتیبیۆتیـک، میتۆتریکســـــات[٣٣٨]، میتیلـدۆپـا[٣٣٩]، ســیپرۆتۆرۆناسـیتات[٣٤٠]؛ مادەگەلی شـیمیایی وەکو پۆلیوینیلکلۆرید[٣٤١]، ئەمینە بۆنـدارەکـان[٣٤٢]، پێکهـاتەکـانی نیترۆســـۆ[٣٤٣]، هـایـدرۆکـاربۆنە بۆندارە چەند ئاڵقەییەکان[٣٤٤]؛ مادەگەلی کانزایی[٣٤٥] وەکو ئارسـنیک[٣٤٦]، ئـاســـبیســـتۆس (لۆکە یـان پەمووی ئـاگرنەگر)[٣٤٧]، کـادمیوم[٣٤٨] و کرۆمیوم[٣٤٩]. ســـەرکوتکەرەکـانی تومۆر[٣٥٠]، وەکو RB1 و $P^{53}$، لە ســەرهەڵدانی شـێرپەنجەی جگەردا ویچوونی نەخشـی گرینگیان هەیە. لەوە دەچێ بەپێی ئەوەی کە سیرۆزی جگەر لە خانەکاندا دەبێتە هۆی گۆڕانی ژنێتیکیی پێشـــوەخت، ڕیخۆشــکەری پێکهاتنی گۆڕانکارییەکی مەترســـیدار بێ. هەڵبەت تا ئێســـتا لەم بوارەدا کارێکی زۆر نەکراوە. ئـاشـــیدا[٣٥١] و هـاوکـارەکـانیشـــی لە ڕاپۆرتێکدا بـاســـی نەبوونی

---

336 Contraceptives
337 Andogene
338 Methotrexate
339 Methyldopa
340 Cyproterone acetate
341 Polyvinyl chloride
342 Aromatic amine
343 Nitroso compounds
344 Polycyclic aromatic hydrocarbons
345 Inorganic substance
346 Arsenic
347 Asbestos
348 Cadmium
349 Chromium
350 Tumor suppressor
351 Ashida

هێترۆزیگۆسـیتی[٣٥٢] له شـێرپەنجەی خانەی جگەر و سـیرۆز دەکەن. نەبوونی هێترۆزیگۆسـیتی و تێکچوونی پێکهاتە و کاری ژێنی $P^{53}$ له زۆربەی شـێرپەنجەکانی خانەی جگەردا دیاری کراون و موتاسـیۆنی ئەم ژێنە لە نزیکەی ٥٠٪ی شـێرپەنجەی جگەر لە هیندسـتان، چین و باشـووری ئەفریقا، کە ئافلاتۆکسـین وەکو کەرتێک لە ڕێژیمی نانخواردنیان هۆی سـەرەکیی شـێرپەنجەی جگەرە، دیتراوە. ئەم موتاسـیۆنە تایبەتییە و لە وڵاتە ئورووپاییەکاندا بە دەگمەن ڕوو دەدات.

## قەوارە و کاری جگەر




قەوارەی جەرگ

پاش پێسـت، جگەر دووەمین ئەندامی گەورەی لەشـی مرۆڤ و گەورەترین گلاندە[٣٥٣] [ڕژێنە] (مامناوەندیی کێشـی جگەر ١٥٠٠ گرامە. ئەندازەی جگەر لە پیاواندا لە نێوانی ١٥٠٠ هەتا ١٨٠٠ گرام و لە ژناندا ١٢٠٠ هەتا ١٥٠٠ گرامە). قورسـایی جگەر ٢،٣٪ هەتا ٣٪ی کێشـی لەش پێک دەهێنێ. جگەر لە ژێرەوەی دیافراگم و لە بەشـی ڕاستی سەروو و نیوەڕاستی سک[٣٥٤] جێگیر بووە و بۆ بەشی چەپی

---

352 Heterozygosity
353 Gland,
354 Midabdomen

ســەرووی زگ درێژ بووەتەوە. جگەر بە شــكڵی ســێپاڵە یان هۆرەیە (پواز)[355] و ڕووی بنەكەی بەرەو ڕاســـت و لوتكەكەی بەرەو چەپە. ڕەنگی جگەر قاوەیی پەمەییباوە.[356] لە ڕوانگەی ئاناتۆمییەوە بە هۆی لیگامێنتی فالْســیفۆرم[357] (بەندۆكی داســوولكەیی) بۆ دوو گەورەلۆبی ڕاست و بچووكەلۆبی چەپ دابەش دەبێ. لە ڕوانگەی نەشتەرگەرییەوە جگــەر بە هۆی گەورەدرزێــك (هێڵی كــانتلی[358]) بۆ دوو لۆبی بە ئەندازەی نزیــك بە یەك دابەش دەكرێ. هەر یەك لەم لۆبانە بۆ دوو بەش[359] دابەش دەبن. لۆبی ڕاســـت بە هۆی خوێنهێنەری هێپاتیكی ڕاست[360] بە بەشی پێش و پاش و لۆبی چەپ[361] بە هۆی خوێنهێنەری هێپاتیكی چەپ بە بەشــی نێوەڕاســت (چوارگۆشــە[362]) و لاترال[363] (لە لاوە) دابەش دەبێ. خوێنهێنەری پۆرت، جگەر بۆ دوو بەشــی ســەروو و خواروو دابەش دەكا. بەشــی پشتەوەی لۆبی ڕاست و لۆبی كلكی[364] لە وێنای پێشــەوەی جگەردا نابینرێن (لۆبی كلكی (كەرتی I) جێگیرە لە كیســـەی بچووك لە ڕووبەری خوارووی جگــەر لە نێوان كلۆرە خوێنهێنەرەی خواروو[365] لە ڕاســـتەوە و لیگامێنتی وێنۆزم (بەندۆكی خوێنهێنەری)[366] لە چەپەوە و پۆرتــا هێپــاتیس (ڕەوگەی جگــەری، دەرزیی ئاسۆیی جگەر)[367] لە پێشــەوە؛ بەشــی پێشــەوەی لۆبی ڕاســت ســـنووری ڕاســـتی لاترال پێك دەهێنێ. هەر بەشـــێكی لۆبەكان بۆ

---

355 Wedge
356 Pinkish brown
357 Falciform ligament
358 Cantlie's line
359 Sector
360 Right hepatic vein
361 Left hepatic vein
362 Quadrate
363 Lateral
364 Caudate
365 Inferior vena cava
366 Ligamentum venosum
367 Porta hepatis

کەرتەکان[٣٦٨] دابەش دەبێ (بەپێی پۆلبەندیی Couinaud)؛ هەر کام لەم کەرتانە ڕەوتی خوێنی و دریناژی زراویی[٣٦٩] تایبەت بە خۆیان هەیە. لەسەر یەک، جگەر بۆ هەشت کەرت دابەش دەکرێ. لە ڕوانگەی هیستۆلۆژییەوە، جگەر لە خانەکانی پارانشیمی[٣٧٠] یان هێپاتۆسیتەکان[٣٧١] (٦٠٪ هەتا ٦٥٪ی خانەکانی جگەر) و ناپارانشیمی[٣٧٢] وەکو خانەکانی ئەندۆتلیالی[٣٧٣] (١٥٪ هەتا ٢٠٪ی خانەکانی جگەر)، خانەکانی کۆپفێر[٣٧٤] (٨٪ هەتا ١٢٪) و ماهوارەیی (سەتەلایتی)[٣٧٥] ٣٪ هەتا ٨٪ی خانەکانی جگەر) و خانەکانی پیت[٣٧٦] (کەمتر ٢٪ی خانەکانی جگەر) پێک هاتووە. جگەر دوو ڕەوتی خوێنی، واتە خوێنهێنەری پۆرت و خوێنبەری جگەری لە خۆ دەگرێ. لە خولەکێکدا نزیکەی ٣٠٠ ± ١٥٠٠ میلیلیتر خوێن دەگاتە جگەر، نزیکەی ٧٠٪ی ئەم خوێنە لە ڕێگەی خوێنهێنەری پۆرت و نزیکەی ٣٠٪ی لە ڕێگەی خوێنبەری جگەرییەوەیە. جگەر ڕۆژانە ٥٠٠ هەتا ١٥٠٠ میلیلیتر زراو دروست دەکا. زراوی پێکهاتوو لە لایەن خانەکانی جگەر لە ڕێگەی بۆرییەکانی نێو جگەرەوە دەچێتە نێو بۆریی هاوبەشی زراوی[٣٧٧]. لە کاتی برسێتیی سپاسمی تۆنیکی سفینکتەری ئۆدی (لە ناوچەی واتەردا) نیوەی زراو دەڕژێنێتە نێو کیسەی زیلک. پاش نانخواردن بە هۆی ئازادبوونی کۆلەسیستۆکینین[٣٧٨]، گرژبوونی کیسەی زیلک و شلبوونەوەی سفینکتەری ئودی، زراوی پاشەکەوتکراو لە کیسەی زیلکدا دەڕژێتە نێو ڕیخۆڵە و بەشداری لە

---

[368] Segments
[369] Biliary drainage
[370] Parenchymal cells
[371] Hepatocytes
[372] Non-parenchymal cells
[373] Endothelial cells
[374] Kupffer cells
[375] Hepatic stellate cells
[376] Pit cell
[377] Common bile duct
[378] Cholecystokinin

ڕەوتی هەرسـکردنی چەوریدا دەکا. هەروەها جگەر بەشـداری لە میتابولیسـمی کاربۆهایدراتەکان، پرۆتین، پاشـەکەوتکردن و چالاککردنی ڤیتامینەکان و مادەگەلی کانزایی، گۆڕینی ئامۆنیاک بە ئوورە، میتابۆلیسمی سترۆیدەکان، پالاوتنی مادەگەلی زیانبەخش و... دەکا.

## پاتۆلۆژی

شێرپەنجەی خانەی جگەر (HCC) تومۆرێکی مەترسیدارە (کوشندە) و لە هێپاتۆسیتەکانەوە سەرچاوە دەگرێ. HCC بە گشتی تۆپەڵەنەرمێکی قاوەیی کەمڕەنگ یان کاڵە بە سترۆمایەکی[379] یەکجار کەمەوە. ئەم تومۆرە زۆر جار بە هۆی فرەڕەگبوونی پڕ لە ناوچەی هێمۆراژیکە[380]. بەشێک لە تومۆر بە هۆی بەرهەمهێنانی زراو ڕەنگی سەوز لە خۆ دەگرێ و ئەمە وەکو نیشانەیەکی تایبەتی بۆ دیاریکردنی HCC پێناسە دەکرێ. زۆربەی پۆلبەندییەکانی شێرپەنجەی خانەی جگەر پالاوتە یان پوختەی پۆلبەندیی "**یەگگل**"ن[381] لە سالی ١٩١٠ زاییندا. یەگگل شێرپەنجەی خانەی جگەر بۆ سێ بەشی بارستدار،[382]، گرێدار[383] و بەربلاو[384] دابەش دەکا. شێرپەنجەی بارستداری خانەی جگەر تاکە تۆپەڵێکی گەورە لەگەڵ یان بەبێ گرێ ماهوارەییەکانە (سەتەلایتییەکانە)[385]؛ شێرپەنجەی خانەی جگەر لە چەشنی گرێدار پێکهاتەی چەندین گرێی جیاجیایە، بەڵام لە چەشنی بەربلاودا گرێیەکی زۆر تەواوی جگەر لە خۆ دەگرێ و وەبیرهێنەری سیرۆزە. وێنای

---

379 Stroma
380 Hemorrhagic
381 Eggel's classification
382 Massive
383 Nodular
384 Diffuse
385 Satellite

هیســــتۆلۆژیکیی شـــێرپەنجەی خانەی جگەر بگۆڕە و نەخشـــەی جۆراوجۆری ســـیتۆلۆژیکی و قەوارەیی هەیە. وێنای ترابیکولار (میلە میلە)[٣٨٦] (٨٠٪) یان پسـۆیدۆگلاندولار[٣٨٧] باوترین چەشـنی قەوارەییە. گۆڕانکـارییە هیســـتۆلۆژیکەکـانی دیکە بریتین لە: ئـاســـینـاری نێکرۆزهەوی[٣٨٨]، ستیاتۆزیس[٣٨٩] یان دیسپلازیی خانەی جگەر[٣٩٠].



پێگەیشتی زنجیرەخانەکانی تومور لە هیپاتوسیلولارکارسینۆمدا

---

386 Trabicular
387 Pseudoglandular
388 Acinar necroinflamation
389 Steatosis
390 Liver cell dysplasia

HCC بۆ چەندین ژێرچەشنە[391] دابەش دەکرێ:

* پێکهاتەی هێپاتۆسێللولار – کۆلانژیوکارسینۆم[392] (HCC-CC). بە دەگمەن دەبینرێ و بەپێی ڕاپۆرتەکان فرەهێرشـــبەرە و بە پانتاییەکی زۆر تەشەنە دەکا، هەروەها لیمفەگرێ ناوچەییەکانش تووشی شێرپەنجە دەکا.

* شێرپەنجەی سکلێرۆزانی خانەی جگەر[393]

* HCC فیرۆلامیلار[394]. بە ڕادەیەکی یەکســـان لە هەردوو ڕەگەز لە تەمەنی گەنجیدا ســـەرهەڵدەدا. ئەم چەشـــنە تومۆرە لە پێوەندی لەگەڵ ڤـــایرۆســـی هێپـــاتیتی "ب" (HBV)دا نییە و کـــاتێـــک لە ڕێگـــەی ڕێزەکسیۆنەوە لابرێ، دوابینییەکی باشی هەیە.

HCC زۆرتر لە لقەکـانی خوێنهێنەری پۆرتیی نێو جگـەر، هەروەهـا خوێنهێنەری ســـەرەکیی پۆرت[395]دا بڵاو دەبێتەوە و دەبێتە هۆی مێتاســـتازی نێو جگەر و پێکهێنەری نیشـــانە کلینییەکانی. هەروەها دزەکـردنـی HCC لە ســـیســـتـەمـی خوێنهێنەری هێپاتیک و خـوێـنـهـێـنەرە ســـەرەکییـەکـانـدا، هـێـپـاتـیـک هـۆی مـێـتـاســـتـازی ســـیســـتـەمیک بە سـیـیەکان، ئێســک و هـــــتـــــد...ه.



میتاستازی شیرپەنجەی مەمک بو نیو تانو پوی جەرگ(نالقەکان)

---

391 Sybtypes

392 Hepatocellular - cholangiocarcinoma

393 Sclerosing HCC

394 Fibrolamellar HCC

395 Main portal vein

بڵاوبوونەوەی لیمفاتیک دەبێتە هۆی لیمفئادنۆپاتیی پۆرتی هێپاتیک[٣٩٦].
دزەکردنی شـــێرپەنجە بۆ نێو یـان دەرەوەی بۆرییەکـانی زراوی جگەر[٢٩٧] زۆر باو نییە، بەڵام دەتوانی هۆی گیرانی زراوی[٣٩٨] بێ.

**پۆلبەندیی TNMی شێرپەنجەی جگەر**

**T – تومۆری سەرەتایی**

**TX** تومۆری سەرەتایی بۆ هەڵسەنگاندن نابێ.

**T0** تومۆری سەرەتایی دیاری ناکرێ.

**T1** تاکە تومۆرێک بەبێ هێرشی ڤاسکولاری[٣٩٩] دەبینرێ.

**T2** تـاکە تومۆر لەگەڵ هێرشـــی ڤاســـکولاری یان چەندین تومۆر دەبینرێ، ئەندازەی تومۆر لە ٥ سانتیمەتر گەورەتر نییە.

**T3a** هەبوونی چەندین تومۆری گەورەتر لە ٥ سانتیمەتر.

**T3b** هەبوونی تـاکە یـان چەنـدین تومۆر بە ئەنـدازەی جۆراوجۆر بۆ تەشـەنەکردن لە لقە سەرەکییەکانی خوێنهێنەری پۆرتال یان هێپاتیک.

**T4** تومۆر(ەکان) بێجگە لە کیســـەی زیلک و پریتەنیۆمی ڤیســـراڵ، ڕاستەوخۆ دزەیان کردووەتە پێکهاتە دڕواسێیەکانەوە.

**N –لیمفەگرێ ناوچەییەکان**

**NX** لیمفەگرێ ناوچەییەکان بۆ هەڵسەنگاندن نابن.

**No** نیشانەیەک لە مێتاستازی لیمفەگرێ ناوچەییەکان نابینرێ.

**N1** سەرهەڵدانی مێتاستاز لە لیمفەگرێ ناوچەییەکان.

**M –مێتاستازی دوور**

**MX** مێتاستازی دوور بۆ هەڵسەنگاندن نابێ.

---

396 Porta heptic lymphadenopathy
397 Inrtra – extra – hepatic bile ductus
398 Biliary Obstruction
399 Vascular invasion

**M0** میتاستازی دوور نابینری.
**M1** سەرهەڵدانی میتاستازی دوور.

**قۆناخەکانی کارسینۆمی جگەر**

| | |
|---|---|
| قۆناخی I | T1/N0/M0 |
| قۆناخی II | T2/N0/M0 |
| قۆناخی IIIA | T3a/N0/M0 |
| قۆناخی IIIB | T3b/N0/M0 |
| قۆناخی IIIC<br><br>IIIC | T4/N0/M0 |
| قۆناخی IVA | هەر کام لەT-یەکان/N1/M0 |
| قۆناخی IVB | هەر کام N-ەکان/هەر کام لەT-یەکان لە/M1 |

**نیشانەکان**

نیشانەکانی شێرپەنجەی خانەی جگەر بریتین لە سکئێشە، دابەزینی نائاسایی قورسایی لەش، بێهێزی و لاوازی، هەستکردن بە پڕبوون[٤٠٠] یان باکردنی[٤٠١] سک، زەردوویی و دڵتێکهەڵهاتن و ڕشانەوە. سەرهەڵدانی نیشانەکان تا ڕادەیەک لە نێوان ناوچە جوگرافییەکاندا

[400] Fullness
[401] Bloating

جیاوازە. بۆ وێنە، سـکێشـه له ناوچەی به مەترسـی سـەرەوە بۆ سـەرهەڵدانی شـێرپەنجەی خانەی جگەر و به تایبەتی له نێوان ڕەشپێستەکانی باشووری ئەفریقا باوترین نیشانەیە، بەڵام له نێوان نەخۆشە چینی یان ژاپۆنییەکاندا تەنها ٤٠٪ هەتا ٥٠٪ی ئەم نیشانەیە دەبینرێ. باکردنی سک لەوە دەچێ ئاکامی ئاوهێنانی[402] سک بێ بە هۆی نەخۆشیی درێژخایەنی جگەر یان پەرەسەندنی خێرای تومۆر. جاروبار نێکرۆزی ناوەندی[403] یان هێمورازیی کتوپڕ[404] بۆ نێو چاڵی پریتۆنیال[405] دەبێتە هۆی مردنی نەخۆش. زەردوویی زۆرتر ئاکامی گیرانی بۆرییەکانی نێو جگەرە وەکو ئاکامی نەخۆشیی جگەر. لەوانەیە خوێنڕشانەوە[406] بە هۆی واریسی سورێنچک[407]، کە بۆ خۆی ئاکامی هیپێرتانسیۆنی پۆرتاڵە[408] لە نەخۆشـدا ببینرێ. لە ٣٪ هەتا ١٢٪ی نەخۆشەکاندا ئێسکئێشە دەبینرێ، بەڵام نێکرۆز وەکو نیشانەی مێتاستازی ئێسک ٢٠٪ی نەخۆشەکاندا سەرهەڵدەدا. گەورەبوونی جگەر (لە ٥٠٪ هەتا ٩٠٪ی نەخۆشەکاندا)، گەورەبوونی سپڵ بە هۆی هیپێرتانسیۆنی پۆرتاڵ و یاو (١٠٪ هەتا ٥٠٪ی نەخۆشەکان) لە نیشانەکانی دیکەی ئەم شێرپەنجەیەن. ڕەنگە لە بەشێک لە نەخۆشەکاندا و بە تایبەتی لە سەرەتادا نیشانەیەکی تایبەتی نەبینرێ. باوترین نیشانەی پارانیوپلاستیک لەم نەخۆشانەدا گۆڕانکاریی نائاسایی بیۆشیمیایی[409] وەکو هیپۆگلیسیمی[410] ئەریترۆسیتۆز[411] (٣٪ هەتا ١٢٪ی نەخۆشەکان)، هیپێرکالسیمی[412]، هیپێرکۆلسترۆلیمی[413]

---

[402] Acittes
[403] Central necrosis
[404] Acute hemorrhage
[405] Peritoneal cavity
[406] Hematemesis
[407] Esophageal varices
[408] Portal hypertension
[409] Biochemical abnormalities
[410] Hypoglycemia
[411] Erythtrocytosis
[412] Hypercalcemia
[413] Hypercholesterolemia

(١٠٪ هەتا ٤٠٪ی نەخۆشـــەکان)، دیســـفیبرینۆگینیمی[٤١٤]، ســـیندۆمی کارسـینۆید، گلۆبولینی لکاو بە تیرۆکسـین[٤١٥]، گۆڕانی نیشـانە دووەمی (لاوەکی)یـە ڕەگـەزییـەکـان[٤١٦] (وەکو ژنیکۆمـاســـتی[٤١٧]، ئـاترۆفی تەستیکولار[٤١٨] و پێگەیشتوویی (باڵغبوویی) پێشوەخت[٤١٩]) و پۆرفیریی پێستیی تاردا[٤٢٠]-یە.

## دیاریکردن

**ســـونۆگرافی** ئـامرازێکی بـاو و هەرزانی بەکـارهێنراوە لە زۆربەی وڵاتـانی جیهـان بۆ دیـاریکردنی شـــێرپەنجەی خـانەی جگـەر، بەڵام **کـامپیوتێرتومۆگرافی** و **وێنـاکردنی زرنگـانەوەی موگنـاتیســـی** بۆ دیاریکردنی شـــێرپەنجە لە قۆناخی ســـەرەتاییدا وردتر و بەکەڵکترن. **ئالفا فیتۆپرۆتین**٤٢١ بە تەنها بۆ دیاریکردنی پێشـــوەخت بەس نییە. ڕادەی هەســـتیاری و تـایبەتمەندیی ئـالفا فیتۆپرۆتین و **ئـالفا یەکی گلۆبولین**[٤٢٢] بە ڕیز نزیکەی ٥٠٪ و ٦٠٪ هەتـا ٩٠٪ە. کـاتێـک ڕێژەی ئـالفـا فێتۆپرۆتین لـە ســـەرووی ٤٠٠ نـانۆگرام لە میلیلیترەوە بێ، پێویسـتە هەبوونی تومۆری گون ڕەت بکرێتەوە. تۆپەڵی گەورەتر لە ٢ ســـانتیمـەتر لەو نەخۆشـــانەی کە ســـیرۆزیان هەیە، بە یارمەتیی کـامپیوتێرتومۆگرافی و وێنـاکردنی زرنگـانەوەی موگنـاتیســـی لەگەڵ کەرەستەی ڕەنگی و **ئانژیۆگرافی** بە باشی دەستنیشان دەکرێ. کاتێک تومۆر تەنها لە ڕێگەی وێنەهەڵگرتنەوە دەستنیشان کرابێ، بەرزبوونی ڕێژەی ئالفافیتۆپرۆتین لە ئاســـت یان ســـەرەوەی ٤٠٠ نانۆگرام لە

---

414 Dysfibrinogenemia

415 Thyroxin - binding globulin

416 Secondary sex characteristics

417 Gynecomastia

418 Testicular atrophy

419 Precocious puberty

420 Porphyria cutanea tarda

421 Alpha-Fetoprotein

422 Alpha 1 - Globulin

میلیلیتردا (٤٠٠ میکرۆگرام لە لیتردا) نیشـــانەیەکی تـایبەتمەنـدە بۆ دیـاریکردنی ئەم شـــێرپەنجەیە. **بیوپسـی لـەژێر چـاودێریی وێنەهەڵگریدا**[٤٢٣] بۆ ئەو نەخۆشانە لەبەرچاو دەگیرێ کە لە پێوەرەکانی ڕادیۆگرافیدا جێگەی گومانە یان ناتەبان لەگەڵ شـــێرپەنجەی خانەی جگەر. هەروەها کاتێک ئەندازەی تۆپەڵە نائاسـاییەکانی جگەر لە نێوان یەک هەتا دوو سـانتیمەترن، بیوپسـی کارێکی پێویسـتە. وێچوونی سـەرهەڵدانی شـــێرپەنجەی خانەی جگەر لە تۆپەڵێک کە ئەندازەی ژێرەوەی ١ سـانتیمەتر بێ، لە ئاسـتێکی زۆر نزمدایە، بەڵام پێویستە ئەم گرێ یان تۆپەڵانە لە ڕێگەی سـۆنۆگرافییەوە هەر ٣ هەتا ٦ مانگ کۆنترۆڵ بکرێن. تەواوی نەخۆشـە مەترسیلێکراوەکان پیویسـتییان بە **چاودێریی** بەردەوام هەیە (بڕوانە خشـــتەی یەک). لە لێکۆڵینەوەیەکی بەهەڵکەوت کۆنترۆڵکراو لە ١٩٠٠٠ نەخۆشـی HBV لە چیندا دیتراوە کە چاودێریی شـــێرپەنجەی خانەی جگەر بە هەڵسـەنگاندنی ئالفا فیتۆپرۆتین و سـۆنۆگرافیی سـک بە مەودای ٦ مانگ هۆی دابەزینی ڕادەی مردن بووە لە پێوەندی لەگەڵ شـــێرپەنجەی خانەی جگەردا هەتـا ڕادەی ٣٧٪، هەرچەنـد لە لێکۆڵینەوەیەکی وێچوو لە چین، چاودێریی شـێرپەنجەی خانەی جگەر لە نەبوونی دەرمانی یەکجاریدا کەڵکێکی وەهای نەبووە.

**خشتەی یەک. نەخۆشە مەترسیلێکراوەکان**

| | |
|---|---|
| هەبوونی شـێرپەنجەی خانەی جگەر لە بنەماڵەدا | نەخۆشەکانی هێپاتیتی B و C |
| نەخۆشیی ئەفریقایی لە تەمەنی سەرەوەی ٢٠ ساڵ | هێپاتیتی ئەلکولی |

423 An image guided biopsy

| | |
|---|---|
| پیاوی ئاســـیایی لە تەمەنی سەرەوەی ٤٠ ساڵ | هیمۆکرۆماتۆزیی میراتی |
| ژنی ئـاســـیـایی لە تەمەنی سەرەوەی ٥٠ ساڵ | سیرۆزی زراویی سەرەکی |
| نەخۆشی تووشبوو بە هیپاتیت B و نەخۆشـەکانی تووشـبوو بە سیرۆز بە هەر هۆیەک | بەرزەباری ڤایرۆســـیی( HBV (DNA<2000IU/ML بەرزبوونی ســـەقامگرتوو یـان ناوبەناوی ALT |

## چارەسەر

چارەســـەرکردنی شـــێرپەنجەی خانەی جگەر بەپێی **قۆناخبەندیی بارسیلۆنایە** بۆ شێرپەنجەی جگەر[٤٢٤] (بڕوانە خشتەی ٢). لە قۆناخی ســـەرەتاییدا چاندنی جگەر[٤٢٥] بەکەڵکترین شـــێوەی دەرمانە. بەپێی **پێوەری میلان**[٤٢٦]، کاتێک نەخۆش تووشـــی ســـیرۆزی جگەر بووبێ، ئینـدیکـاســـیۆن بۆ چـانـدنی جگـەر بریتییە لە: هەبوونی تۆپەڵی شـێرپەنجەی خانەی جگەر لەوپەڕیدا بە ئەندازەی ٥ سـانتیمەتر یان ٣ تۆپەڵ یان گرێ کە لەوپەڕیدا بە ئەندازەی ٣ سانتیمەترە. **ڕێزەکسیۆنی نەشـتەرگەری**[٤٢٧] بۆ ئەو نەخۆشـانە لەبەرچاو دەگیرێ کە فیبرۆز یان هیپێرتانســیۆنی پۆرتاڵ لەواندا پەرەی نەگرتووە یان سـیرۆزی جگەر بە تەواوی قەرەبوو کراوە، هەروەها شـوێنی تومۆر بۆ نەشـتەرگەری گونجاوە. شێوەکانی نانەشتەرگەری بریتین لە: **شیمۆئەمبۆلیزاسیۆنی خوێنبەری**[٤٢٨]، **شـــەپۆلی رادیۆیی**[٤٢٩] و **لێدانی ئەتانۆل**[٤٣٠] لە ڕێگەی پێســـتەوە، لەوانەیە ئەم کارانە ببنە هۆی درێژکردنەوەی کورتخایەنی

---

[424] Barcelona Classification for Liver Cancer(BCLC) system
[425] Liver transplantation
[426] Milan criteria
[427] Surgical resection
[428] Chemoembolization
[429] Radiofrequency
[430] Ethanol injection

ماوەی زیندوومانەوەی نەخۆش، هەروەها پردێک بن بۆ چاندنی جگەر. بە هۆی مەترسییەکانی نەشتەرگەری و بەتایبەتی خوێنبەربوونێک کە بە ئاسانی کۆتایی پێ نایە، نەشتەرگەریی جگەر زۆر درەنگ و لە کۆتایی سەدەی ١٩ی زایینییەوە پەرەی گرت. مەترسیی سەرهەڵدانی ئاڵۆزی لە هیپاتێکتۆمییەکی گەورە (مردن ٥٪ هەتا ١٠٪) بە هۆی نەخۆشییە بنچینەییەکانی جگەر و پۆتانسیەلی سەرهەڵدانی ناتەواویی جگەر بەرزە. بەرگیرانی خوێنهێنەری پۆرتاڵ لەوە دەچێ جاروبار هۆی ئاترۆفی ئەو لۆبانە بن کە تووشی شێرپەنجەی خانەی جگەر بوون. لە سیرۆزی جگەردا هەرچەشنە نەشتەرگەرییەکی گەورەی جگەر لەوە دەچێ ببێتە هۆی ناتەواویی جگەر.

پۆلبەندیی Child-pugh[431] لە ناتەواویی جگەردا دوابینییەکی جێمتمانەیە بۆ هەڵسەنگاندنی خۆڕاگری[432] لە نەشتەرگەریی جگەردا و پێویستە تەنها ئەو نەخۆشانە بۆ نەشتەرگەری لەبەرچاو بگیرێن کە لە چوارچێوەی "چایلدی" یەکدا دەگونجێن. لە شێرپەنجەی خانەی جگەردا، کە جگەر جارێ تووشی سیرۆز نەبووە، چارەسەری چاککەرەوە لە ڕێگەی ڕێزەکسیۆنی بەشێک لە جگەر، واتە هیپاتێکتۆمیی ناتەواوەیە. چارەسەری چاککەرەوەی شێرپەنجەی خانەی جگەر بە گشتی لە ڕێگەی ڕێزەکسیۆن لە تان و پۆی ساغی جگەر لەگەڵ بە لایەنی کەمەوە مەودایەک بە پانتایی یەک سانتیمەتر لە لێواری ڕێزەکسیۆنەکەوەیە. شێوەی نەشتەرگەری لە پێوەندی لەگەڵ گۆڕانکاریی سیرۆتیک یان سەرهەڵدانی هیپێرتانسیۆنی پۆرتالە. لە کاتی بەرتەسک و سنووورداربوونی فونکسیۆنی پاشەکەوتکراوی پارانشیمی[433] جگەر، کەڵک لە ڕێزەکسیۆنی پەراوێزی، ڕێزەکسیۆنی یەک یان چەند کەرتی جگەر، واتە سیگمێنتێکتۆمی وەردەگیرێ.

---

[431] Child-pugh classification
[432] Tolerance
[433] Reserve Parenchyma

## شیمۆدەرمانی

شـــیمۆدەرمانی نەخشـــێکی لە درێژکردنەوەی ماوەی زیندوومانەوەی نەخۆشـــدا نییە. لەوە دەچێ ســـۆرافینیـب[٤٣٤]، بەرهەڵســـتکاری مۆلتیکیناز[٤٣٥]، ماوەی زیندوومانەوەی نەخۆش بۆ نزیکەی ٣ مانگ درێژ بکاتەوە.



میتاستازی تومۆری کولۆرەکتال بۆ نێو باڵی چەپی جەرگ

---

[434] Sorafenib
[435] Multikinase inhibitor




**خشتەی ٢. چارەسەرکردنی شێرپەنجەی خانەی جگەر بەپێی قۆناغبەندیی بارسێلۆنا بۆ شێرپەنجەی جگەر**

## دوابینی

ماوەی زیندوومانەوەی نەخۆش لە کاتی چارەسەری چاککەرەوە بۆ ٥ ســـاڵ لە پێوەندی لەگەڵ قۆناخی نەخۆشـــیی جگەر وەکو هۆی ئەم نەخۆشییە و شێرپەنجەی خانەی جگەر و بڕین و دەرهێنانی ڕادیکاڵی تومۆرەکە بەم چەشنەیە:

* پاش چاندنی جگەر ٤٠٪ هەتا ٧٠٪.

* پاش ڕیزەکسیۆنی بەشێک لە جگەر ٢٠٪ هەتا ٥٠٪.

* پاش دەرمانی خۆجێی و ناوچەیی ٢٠٪ هەتا ٥٠٪.

لە کاتی دەرمانی سوکنایدەردا مامناوەندیی زیندوومانەوەی نەخۆش ٦ هەتا ١٢ مانگە.

**چاودێری**: لەو نەخۆشانەی کە تووشی سیرۆزی جگەر بوون (بە تایبەتی ئەوانەی کە تووشی HBV و HCV بوون)، پێویستی بە چاودێری لە ڕێگەی سونۆگرافی، کۆنترۆڵی ئالفا فیتوپرۆتین، جارێک لە هەر ٦ مانگدایە.

# سەرچاوەکان

1- K. Beckh, Leber, Anatomie und Physiolgische Funktion& Hepatozelluäres Karzinom, Gastroenterologie compact. Alles für Klinik und Praxis, Prof. Dr. Med. Karlheinz Beckh, Thema, 2013
2- Robin Smit, Anatomy of the liver segments, http:// www.radiologyassistant.nl /en/p4375bb8dc241d/ anatomy-of-the-liver-segments.html
3- Vinay Kumar Kapoor, MBBS, MS؛ Chief Editor: Thomas R Gest, PhD more… Liver Anatomy, Updated: Dec 13, 2013, http://emedicine.medscape.com/article/1900159-overview
4- IAEA(International Atomic Energy Agency. Tends and Practices in Diagnosis and Treatment of Hepatocellular Carcinoma, Vienna 2010
5- Simon D Taylor – Robinson, MD und … Hepatocellular carcinoma: Epidemology, risk factors and pathogenesis, World Gastroenterol 2008 July 21؛ 14(27): 4300-4308
6- Naugler WE, Sakurai T, Kim S, Maeda S, Kim K, Elsharkawy AM, et al. Gender disparity in liver cancer due to sex differences in MyD88-depndent IL-6 production. Sience 2007 6؛317:121-4.
7- Yang JD, Roberts LR. Hepatocellular carcinoma؛ A global view. Nat Rev Gastroenterol Hepatol 2010؛7:448-5
8- Luca Cicalese, MD, FACS؛ Chief Editor: John Geibel, MD, DSc, MSc, MA more… Hepatocellular carcinoma, Updated: May 30, 2014, http://emedicine.medscape.com/article/197319-overview#a4
9- Amy S. Oxentenko, MD, FACP, Editor, Assistant Professor of Medicine& … MKSAP 16, Hepatoceular 108dvanced108,p 65, Gastroenterology and Hepatology. 2015, ACP, USA
10 Ashida K, Kshimoto und …. Loss of heterozygosity of the retinoblastoma gene in liver cirrhosis accompanying hepatocellular carcinoma. J cancer Res'Clin Oncol 1997؛123: 489-95
11- Terence D Rhodes, MD, PhD؛ Chief Editor: Jules E Harris, MD more… Hepatocellular Carcinoma Staging, http://emedicine.medscape.com/article/2007061-overview. Updated: Sep 06, 2013
12- Chen JG, Parkin DM, Chen QG, LuJH, Shen QJ, Zhang BC, et al, Screening for liver cancer, result of randmised controlled trial in Qidong, China J Med Screen 2003؛ 10:204-9
13- Edouard Matevossan und..., Das HepatozellulÄre Karzinom, Screening, Diagnostik und Therapie, Klinikarzt, Medizin im Krankenhaus 6+7/2012, Demeter Verlag.

# بەشی پێنجەم

## شێرپەنجەی داری زراوی[436]

## پەتاناسی

کارسینۆمی کیسەی زیلک و بۆرییەکانی دەرەوەی جگەر ٥،٠٪ هەتا ١٪ی تەواوی شێرپەنجەکان پێک دەهێنن و وەکو شێرپەنجە دەگمەنەکان بە ئەژمار دێن. هەر ساڵ نزیکەی ٢ هەتا ٣ لە هەر ١٠٠٠٠٠ کەس لە جیهاندا تووشی کارسینۆمی کیسەی زیلک یان بۆریی زراو دەبن. کۆلانژیۆکارسینۆم پاش کارسینۆمی هێپاتۆسێلولار دووەمین تومۆری سەرەکیی جگەرە لە جیهاندا. ڕێژەی سەرهەڵدانی کۆلانژیۆکارسینۆم لە وڵاتە ڕۆژئاواییەکاندا لە ٢ هەتا ٦ لە هەر ١٠٠٠٠٠ کەسە لە ساڵدا. لە بریتانیا کۆلانژیۆکارسینۆم هۆی مردنی ١٥٠٠ کەسە لە ساڵدا (بە ڕادەیەکی بەرامبەر لە ژن و پیاودا). ئەم شێرپەنجەیە لە وڵاتگەلێکی وەکو ئیسرائیل (٧،٣ لە هەر ١٠٠٠٠٠ کەسە لە ساڵدا) و ژاپۆن (٥،٥ لە هەر ١٠٠٠٠٠ کەس لە ساڵدا) و لە باشووری ئاسیا زۆرتر سەرهەڵدەدا. جیاوازییەکی بەرچاو لە ڕێژەی

---

[436] Cancer of the Biliary Tree

سەرهەڵدانی شێرپەنجەی کیسەی زیلک لە جیهاندا هەیە. بەرزترین ڕێژەی سەرهەڵدانی لە ناوچەگەلێکی وەکو هیندستان، کۆریا، ژاپۆن، کۆماری چیک، سلۆڤاکیا، سپانیا، کۆلۆمبیا، شیلی، پیرۆ، بۆلیڤی و ئێکوادۆرە. بەرزترین ڕێژەی سەرهەڵدانی شێرپەنجەی کیسەی زیلک لە نێو وڵاتە ناوبراوەکان لە پیرۆ و شیلیدایە. ڕادەی سەرهەڵدانی ئەم شێرپەنجەیە لە نێو ژنانی هیندی لە جیهاندا لە بەرزترین ئاستی خۆیدایە (لە ٨،٨ هەتا ٢١،٢ لە هەر ١٠٠٠٠٠ کەس لەساڵدا). لە جیهاندا نزمترین ڕادەی سەرهەڵدانی شێرپەنجەی زیلک لە بریتانیا، دانیمارک و نۆرویژە. وێچوونی سەرهەڵدانی شێرپەنجەکانی دەزگای زراو هەتا دەیەی چوارەمی ژیان گەلێک نزمە، بەڵام لە دەیەی شەشەمی ژیاندا بە چەشنێکی بەرچاو بەرز دەبێتەوە و لوتکەی سەرهەڵدانی لە نێوان تەمەنی ٥٠ هەتا ٧٠ ساڵیدایە. کارسینۆمی کیسەی زیلک لە ژنان بە بەراورد لەگەڵ پیاوان بەرزترە (سێ بە یەک)، لەوە دەچێ ئەمە لە پێوەندی لەگەڵ ئەو ڕاستییە بێ کە بەردی زیلک وەکو هۆکاری سەرەکیی کارسینۆمی کیسەی زیلک لە ژناندا باوترە و لە ٧٥٪ هەتا ٨٠٪ی ئەوانەی کە تووشی کارسینۆمی کیسەی زیلک بوون، بەردی زیلک دیتراوە.

## هۆ و فاکتەرە مەترسیدارەکان

پێوەندییەکی نزیک لە نێوان کۆلانژیۆکارسینۆمەکان و گۆڕانکاریی سیستیکی[٤٣٧] بۆریی زراو دیتراوە (Voyle et al. 1983)، لەوە دەچێ ئەمە بە هۆی بەیەکگەیشتنی نائاسایی بۆریی پانکراتیک و بۆریی زراو بێ (Pitt et al. 1995). وێدەچێ ڕەفلاکسی ئەنزیمەکانی پەنکریاس کاریگەرییەکی زیانبەخشی لەسەر ئیپیتەلیومی بۆریی زراو لە چوارچێوەی AJPBD (واتە anomalous junction of the paencreaicobiliary ducts) هەبێ (Tanaka et al.1993). بەردی زیلک لە

---

437 Cystic changes

٧٥٪ هەتا ٨٠٪ی نەخۆشـەکانی کارسـینۆمی کیسـەی زیلکدا دیتراوە، ئەمە لە حاڵێکدایە کە تەنها لە نزیکەی ٢٪ی تەواوی ئەو نەخۆشـانەی کە بەردی زیلکیان هەیە، شێرپەنجەی کیسەی زیلک سەری هەڵداوە.

**فاکتەرە مەترسیدارەکانی دیکە بۆ شێرپەنجەی کیسەی زیلک بریتین لە:**

* رەقبوونی دیواری کیسـەی زیلـک کە زۆرتر لە پێوەنـدی لەگەڵ بەردی زیلکدایە.

* پۆلیپی بێزیان[٤٣٨]ی کیسەی زیک (گەورەتر لە ١ سانتیمەتر).

* چڵکی درێژخایەنی باکتریایی دەزگای زراوی بە هۆی "سـالمۆنێلای گرانەتا"[٤٣٩]، بە تایبەتی لە ئاسیادا.

**فاکتەرە مەترسیدارەکان بۆ سەرهەڵدانی کارسینۆمی بۆریی زراوی نێو و دەرەوەی جگەر بریتین لە:**

* کۆلانژیتی سکلرۆزانی سەرەکی[٤٤٠].

* نائاساییبوونی زگماکیی بۆریی زراوی.

* تومۆرە بێزیانەکان وەکو پاپیلۆماتۆزی زراوی[٤٤١].

* چڵکی مشـەخۆری (میملەیی) هێپـاتۆبیلیـار[٤٤٢] وەکو Clonorchis sinensis لە ژاپۆن، کۆریا و ڤێتنام، هەروەها Opisthorchis viverrini زۆرتر لە تایلەند، لاوس و مالیزیا.

* کارتێکەریی تۆکسـیک – دی ئۆکسـیدی تۆریۆم[٤٤٣] کە وەکو مادەی رەنگی لە سـاڵەکانی ١٩٣٠ هەتا ١٩٥٠ لە رادیۆلۆژیدا کەڵکیان لێ وەردەگرت و لێکۆڵینەوەکـان رۆڵی ئەوانیـان لە سـەرهەڵـدانی شێرپەنجەی جگەر و بۆریدا نیشان داوە.

---

438 Benign polyps
439 Salmonella typhi
440 Primary Sclerosing Cholangitis (PSC)
441 Biliary papillomatosis
442 Hepatobiliary parasitic infection
443 Thorium dioxide

## قەوارە و کاری دەزگای زراوی

کیسەی زیلک تا ڕادەیەک ئەندامێکی بچووک، بەڵام لە ڕوانگەی نەشتەرگەرییەوە ئەندامێکی پڕبایەخی لەشە و لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا زۆرترین نەشتەرگەری لەسەر ئەم ئەندامە دەکرێ. کیسەی زیلک شکڵی هەرمێی هەیە و درێژییەکەی ١٠ سانتیمەترە. ئەم کیسەیە لە نێو قووڵکەیەک لە کەرتەکانی IVB و V ڕووبەری خوارووی جگەردا جێگیر بووە، لە حاڵەتی ئاساییدا نزیکەی ٣٠ هەتا ٥٠ میلیلیتر زراو و لە کاتی گیرانی بۆریی زراوبەر توانایی پاشەکەوتکردنی تا نزیکەی ٣٠٠ میلیلیتری هەیە. بۆرییەکانی زراوبەر بریتین لە بۆریی نێو و دەرەوەی جگەر. بۆرییەکانی دەرەوەی جگەر، بۆریی ڕاست و چەپی جگەر، بۆریی هاوبەشی جگەر، بۆریی سیستیک و بۆریی هاوبەشی زیلکی یان کلدۆک لە خۆ دەگرێ. بۆریی هاوبەشی زیلکی لە ڕێگەی زمانەی ئۆدییەوە دەکرێتەوە نێو دوازدەگرێ. جگەر ڕۆژانە ٥٠٠ هەتا ١٥٠٠ میلیلیتر زراو دروست دەکا. زراوی پێکهاتوو لە لایەن خانەکانی جگەر، لە ڕێگەی بۆرییەکانی نێو جگەر دەچێتە نێو بۆریی هاوبەشی زیلکی. لە کاتی برسێتیدا سپاسمی تونیکی سفینکتەری ئۆدی (لە ناوچەی واتەردا) نیوەی زراو دەڕژێنێتە نێو کیسەی زیلک. پاش نانخواردن بە هۆی ئازادبوونی کۆلەسیستۆکینین، گرژبوونی کیسەی زیلک و شلبوونەوەی سفینکتەری ئۆدی، زراوی پاشەکەوتکراو لە کیسەی زیلکدا دەڕژێتە نێو ڕیخۆڵە و بەشداری لە ڕەوتی هەرسکردنی چەوریدا دەکا.



## پاتۆلۆژی

کارسـینۆمەکانی دەزگای زراوی بەپێی شـوێنی سـەرهەڵدانیان بۆ کارسـینۆمەکانی کیسـەی زیلک[٤٤٤] و کۆلانژیۆکارسـینۆمەکانی بۆریی زراوی نێو جگـەر[٤٤٥] و دەرەوەی جگـەر[٤٤٦] دابەش دەکرێن. ٨٠٪ی شێرپەنجەی کیسەی زیلک و بۆریی زراوی لە ئێپیتەلیومەکانەوە سەرچاوەیان گرتووە. پتر ٩٠٪ی کۆلانژیۆکارسـینۆمەکان لە چەشـنی ئادنۆکارسـینۆمن. چەشـنەکانی دیکە وەکو شـێرپەنجەی خانەپوولەکەدارەکان، سـارکۆمەکان و شـێرپەنجەی خانە بچووکەکان، هەروەها لیمفۆمەکان، هەر کام کەمتر ٥٪ی



رەخنەی کوی خانە نائاساییە پوولەکەدارەکان(نەستیرەکان) لە دیواری کیسەی زیلک

کۆلانژیۆکارسینۆمەکان پێک دەهێنن. دزەکردنی خۆجێیی لە پۆرتا هێپاتیس[٤٤٧] باوە، هەروەها تەشـەنەکردن یان تووشـکردنی ڕاسـتەوخۆی جگـەر و کارسینۆماتۆزی پریتۆنیال[٤٤٨].

---

[444] Gallbladder cancer
[445] Interahepatic cholangiocarcinomas
[446] Extrahepatic cholangiocarcinomas
[447] Porta hepatis
[448] Peritoneal carcinomatosis

کۆلانژیۆکارسینۆمەکان بەم چەشنانە دابەش دەکرێن:

* **سکلێرۆزان**[449]. ڕادەی سەرهەڵدانی ئەم چەشنە زۆرترە لەوانەی دیکە و دەبێتە هۆی کاردانەوەی توندی دیسمۆپلاستیک[450] لە چەشنی ئەستووریی بەربلاوی بۆری، بەبێ سەرهەڵدانی تۆپەڵێکی دیاریکراو[451]. چارەسەرکردنی ئەم چەشنە تومۆرە گەلێک دژوارە.

* **نۆدولار**[452]. ئەم چەشنە دەبێتە هۆی پێکهاتنی تۆپەڵێکی نائاسایی و تەشەنە بۆ جگەر دەکا.

* **پاپیلاری**[453]. ئەم چەشنە بە دەگمەن دەبینرێ و بە گشتی ئادنۆکارسینۆمێک بە پلەی خوارەوەیە. ئاستی بڵاوبوونەوەی چەشنی پاپیلاری زۆر نزمە، نابێتە هۆی کاردانەوەی دیسمۆپلاستیک و پرۆگنۆزێکی باشی هەیە.

کۆلانژیۆکارسینۆمەکانی نێو جگەر زۆرتر لە چەشنی نۆدولار و کۆلانژیۆکارسینۆمەکانی دەرەوەی جگەر زۆرتر لە چەشنی سکلێرۆزانن. لە ڕوانگەی هیستۆلۆژیکییەوە، کۆلانژیۆکارسینۆمەکان لە چەشنی ئادنۆکارسینۆمی موسینپێکهێنەری[454] سازکراو لە پێکهاتەی ئاسینار[455] و ڕەقن[456]. بیۆلۆژیی مۆلیکولی[457] کۆلانژیۆکارسینۆمەکان جارێ بە باشی ڕوون نەبووەتەوە. کارسینۆمی کیسەی زیلک بۆ هەوەڵ جار لە لایەن ماکسیمیلان دی ستۆل لە ساڵی ١٧٧٧ی زایینیدا شی کرایەوە. لە شێرپەنجەی کیسەی زیلکدا ڕەوتی پەرەسەندنی تومۆر لە دیسپلازی[458] بۆ کارسینۆم لە جێی هەتا کارسینۆمی هێرشبەر دەبینرێ. لە ٩٠٪ی شێرپەنجەی کیسەی زیلکدا لە ئێپیتەلیومەکانی دەوری کیسەی زیلک، دیسپلازی

---

449 Sclerosing
450 Intense desmoplastic reaction
451 Defined mass
452 Nodular
453 Papillary
454 Mucin-producing adenocarcinomas
455 Acinar
456 Solid
457 Molecular biology
458 Dysplasia

ســـەخت و كارســـيتۆمی لە جێی دیاری كراوە ئادنتۆم ١,١٪ی بيوپســـيەكانی كۆليســيســتەكتۆمی[٤٥٩] ديتراوە ٦٠٪ی تومۆرەكان لە فوندوس، ٣٠٪ی لە جەســتە و ١٠٪ی لە ملی كيســـەی زيلكدا ســـەرهەڵدەدەن. ئەو تومۆرانە كە لە مل و توورەكەی (كيســـەی) هارتمەن[٤٦٠]دا ســـەرهەڵدەدەن، لەوە دەچێ لە نێو ســيســتيك[٤٦١] و بۆريی هاوبەشی زراويدا بڵاو ببنەوە. شێرپەنجەی كيسەی زيلک بەسەر چەشنی ئينفيلتراتيف، نۆدولار و پاپيلاری دابەش دەبێ و وەكو كۆلانژيۆكارســـيتۆم چەشـــنی ئينفيلتراتيف باوترين چەشـــنی شـــێرپەنجەی زيلكە و چەشـــنی پاپيلار باشـــترين پرۆگنۆزی هەيە. باوترين چەشـــنی هيســـتولۆژيكی شـــێرپەنجەی كيســـەی زيلک ئادنۆكارســـينۆمە. تومۆرەكانی مزنشـــيمالی ســـەرەتايی زيانبەخشـــی كيســـەی زيلک[٤٦٢] بريتين لە رابدۆميۆســـاركۆمی ئاوڵەمەیی[٤٦٣]، ليۆميۆســـاركۆم[٤٦٤]، فيبرۆزهيســـتۆســـيتۆمای زيانبەخش[٤٦٥]، ئانژيۆساركۆم[٤٦٦] و ساركۆمی كاپووسی[٤٦٧].

## پۆلبەندیی TNMی شێرپەنجەی كيسەی زيلک

### T –تومۆری سەرەتايی

**TX** تومۆری سەرەتايی بۆ هەڵسەنگاندن نابێ.

**T0** تومۆری سەرەتايی دياری ناكرێ.

**Tis** كارسينۆم لە جێدا.

**T1** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە لامينا پرۆپريا يان چينی ماسوولكەييدا.

* **T1a** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە لامينا پرۆپرياذا.
* **T1b** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە چينی ماسوولكەييدا.

---

459 Cholecystectomy specimens
460 Hartman's pouch
461 Cystic
462 Primary malignant mesenchymal tumors of gallblader
463 Embryonal rhabdomyosarcoma
464 Leiomyosarcoma
465 Malignant fibrous histocytoma
466 Angiosarcoma
467 Kaposi's sarcoma

**T2** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە تـان و پۆی هـاوبەسـتی دەوری ماسوولکەدا[٤٦٨] بەبێ تەشەنەکردنی بۆ چینی سرۆزی یان جگەر.

**T3** پەرەسەندنی تومۆر لە سرۆز (visceral peritoneum)، هەروەها/ یان هێرشی ڕاستەوخۆ بۆ جگەر و / یان پێکهاتە دراوسێیەکان وەکو گەدە، دوازدەگرێ، کۆلۆن، پەنکریاس، ئۆمێنتۆم (تۆر)[٤٦٩] یان بۆرییەکانی دەرەوەی جگەر.

**T4** هێرشی تومۆر بۆ خوێنبەری سەرەکیی پۆرت یان خوێنبەری هێپاتیک یان چەندین ئەندام و پێکهاتەی ئەکستراهێپاتیک.

## N –لیمفەگرێ ناوچەییەکان

**NX** لیمفەگرێ ناوچەییەکان بۆ هەڵسەنگاندن نابن.

**No** نیشانەیەک لە مێتاستازی لیمفەگرێ ناوچەییەکاندا نابینرێ.

**N1** تەشـەنەی تومۆر بۆ لیمفەگرێ ناوچەییەکان بە درێژایی بۆریی سیستیک، بۆریی هاوبەشی زراوی، خوێنبەری هێپاتیک و / یان خوێنهێنەری پۆرت.

**N2** تەشـەنەی تومۆر بۆ لیمفەگرێکانی دەوری ئائۆرت[٤٧٠]، دەوری خوێنهێنەرە هەڵۆڵەکان [٤٧١] و خوێنبەری مێزەنتەریکی سەروو و / یان خوێنبەری سیلیاک[٤٧٢].

## M– مێتاستازی دوور

**M0** مێتاستاز نابینرێ.

**M1** سەرهەڵدانی مێتاستازی دوور.

---

[468] Perimuscular connective tissue
[469] Omentum
[470] Periaortic
[471] Pericaval
[472] Celiac artery lymph nodes

قۆناخەكانی شێرپەنجەی كیسەی زیلك

| | |
|---|---|
| 0 | Tis/N0/M0 |
| قۆناخی I | T1/N0/M0 |
| قۆناخیII | T2/N0/M0 |
| قۆناخیIIIA | T3/N0/M0 |
| قۆناخی IIIB | T1-3/N1/M0 |
| قۆناخیIVA | T4/N0-1/M0 |
| قۆناخی IVB | /N2/M0 هەر كام لە T-یەكان<br>/M1هەر كام لە N-ەكان/ هەر كام لە T-یەكان |

**پۆلبەندیی TNMی كۆلانژیۆكارسینۆم**

**T –تومۆری سەرەتایی**

**TX** تومۆری سەرەتایی بۆ هەڵسەنگاندن نابێ.

**T0** تومۆری سەرەتایی دیاری ناكرێ.

**Tis** كارسینۆم لە جێدا.

**T1a** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە موكۆسدا.

**T1b** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە چینی ماسوولكەییدا.

**T2** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە تان و پۆی هاوبەستی دەوری ماسوولكەدا.

**T3** پەرەسەندنی تومۆر لە جگەر، کیسەی زیلک، گەدە، دوازدەگرێ، کۆلۆن، پەنکریاسدا.

**N –لیمفەگرێ ناوچەییەکان**

**NX** لیمفەگرێ ناوچەییەکان بۆ هەڵسەنگاندن نابن.

**No** نیشانەیەک لە مێتاستازی لیمفەگرێ ناوچەییەکان نابینرێ.

**N1** تەشەنەی تومۆر بۆ لیمفەگرێ ناوچەییەکان بۆریی سیستیک یان بۆریی هاوبەشی زراوی[٤٧٣] یان لیمفەگرێکانی نەوکی لیگامنتی هێپاتۆدیودینال[٤٧٤].

**N2** تەشەنەی تومۆر بۆ لیمفەگرێکانی دەوری پەنکریاس[٤٧٥] (تەنها سەر)، دەوری دوازدەگرێ[٤٧٦]، پانکراتۆدیودۆنالی پشتی[٤٧٧]، دەوری ئائۆرت، سیلیاک، یان مێزەنتەریک.

**M –مێتاستازی دوور**

**M0** مێتاستاز نابینرێ.

**M1** سەرهەڵدانی مێتاستازی دوور.

**قۆناخەکانی کۆلانژیۆکارسینۆم**

| | |
|---|---|
| Tis/N0/M0 | 0 |
| T1/N0/M0 | قۆناخی I |
| T2/N0/M0 | قۆناخی II |

473 Pericholedocha
474 Hilar of hepatoduodenal ligamnet
475 Peripancreatic
476 Periduodenal
477 Posterior pancreatoduodenal

| | |
|---|---|
| قۆناخی III | T1-2/N1-2/M0 |
| قۆناخیIVA | T3/N0-2/M0 |
| قۆناخیIVB | T1-3/N0-2/M1 |

## نیشانەکان

زۆربەی نیشـــــانەکـان بێجگە لە زەردوویی لە کـاتی دیـاریکردنی شـــێرپەنجەکانی دەزگای زراودا تایبەتمەند نین. ئەو نیشـــانانەی کە ســـەرهەڵدەدەن، بریتین لە: دابەزینی نـائاســـایی قورســـایی لەش، دڵتێکهەڵهاتن، ڕشـانەوە، تێکچوونی ڕەوتی هەرسـکردن، هەستکردن بە لاوازی، ئاوهێنانی سک و سکئێشە (بڕوانە خشتەی خوارێ).

| شێرپەنجەی کیسەی زیلک | کۆلانژیۆکارسینۆم |
|---|---|
| سکئێشە | زەردوویـــی (لەگەڵ ئـــاڵـــۆش + ســپیبوونی پیسـایی و ڕەشـبوونی میز) |
| دابەزینی نائاســـایی قورســـایی لەش | دابەزینی نائاسایی قورسایی لەش |
| نیشـــــانەکـانی تـێکچوونی هەرسکردن | سکئێشە |
| دڵتێکهەڵهاتن | هێپاتۆمگاڵی |
| زەردوویی | ئاسیت (ئاوهێنانی سک) |
| | تێکچوونی مەیینی خوێن[٤٧٨] |
| | سووربوونی بەری دەست[٤٧٩] |

[478] Clotting disorders
[479] palmar erythema

| | |
|---|---|
| خاڵی جاڵجاڵۆکەیی[٤٨٠] | |
| ئینسیفالۆپاتیی | |

**خشتەی ١. نیشانەکان**

## دیاریکردن

**تاقیکردنەوەی خوێن** ڕۆڵێکی نزمی لە دیاریکردنی ئەم شێرپەنجانەدا هەیە. لە زۆربەی شێرپەنجەکاندا، هەروەها لە شێرپەنجەکانی دەزگای زراودا، چوونەسەرەوەی ڕادەی قۆناخی کتوپڕی پرۆتین[٤٨١]، ڕێژەی نیشتنی خڕۆکە سوورەکانی خوێن[٤٨٢] و فریتین دەبینرێ. هەروەها ئانیمی و لیکۆسیتۆز و ئەریترۆسیتۆزیش نیشانەیەکی تایبەتمەند نین. لەوە دەچێ ڕادەی نیشانەکەری تومۆر (CA 19-9)[٤٨٣] لە هەردوو شێرپەنجەی کیسەی زیلک و کۆلانژیۆکارسینۆمدا لە سەرێ بێ. بۆ وێنە، لە ٨٥٪ی نەخۆشەکانی کۆلانژیۆکارسینۆمدا (بە هەستیاری ٤٠٪ هەتا ٧٠٪ و تایبەتمەندیی ٥٠٪ هەتا ٨٠٪) چوونەسەرەوەی CA 19-9 دیتراوە. لە حاڵەتی پەرەسەندنی نەخۆشیدا ڕادەی ئالکالین فۆسفاتاز، لاکتات دەهیدۆژناز و بیلیروبین بەرز دەبێتەوە و زۆرتر بایەخی بۆ هەڵسەنگاندنی چۆنێتیی نەخۆش و دوابینی هەیە. وێناکردن لە ڕێگەی **سۆنۆگرافی، کامپیوتێرتومۆگرافی، وێناکردنی زرنگانەوەی موگناتیسی، کۆلانژیۆگرافی[٤٨٤] (MRCP, ERCP, PTC)، ئیندسکۆپیک سۆنۆگرافی و هیستۆلۆژی و سیتۆلۆژی، هەروەها بەکارهێنانی تومۆگرافیی تەواوی جەستە بە دەردانی پۆزیترۆنەوە و کۆلانژیۆسکۆپی**[٤٨٥] یاریدەی ڕەوتی دیاریکردنی ئەم شێرپەنجانە دەدەن.

---

[480] Spider nevi ("liver asterisk")
[481] Acute phase protein
[482] Erythrocyte sedimentation rate
[483] Carbohydrate antigen(CA)
[484] Cholangiography
[485] Cholangioscopy

## چارەسەر

لە شێرپەنجەی کیسەی زیلکدا شێوەی چارەسەرکردنی نەخۆش لە پێوەندی لەگەڵ قۆناخی نەخۆشییەکەدایە. کاتێک شوێنی سەرهەڵدانی تومۆر لە سەرۆزدا بێ، کەڵک لە **کۆلێسیستێکتۆمی کراوە**[486] وەردەگیرێ. لەوە دەچێ **کۆلێسیستێکتۆمی ڕادیکاڵ** لە کارسینۆم لە جێ (T1N0M0)، کە بەستراوە بە دیواری کیسەی زیلکەوە و تەشەنەی بۆ پێکهاتە دراوسێیەکان نەکردووە، ڕۆڵی چاککەرەوەی هەبێ. لە کاتی پەرەسەندنی تومۆر وپچوونی تراپیی چاککەرەوە نییە و هەنگاوگەلی سوکنایدەر بریتین لە نەشتەرگەری بۆ ئاساییکردنەوەی ڕەوتی زراو یان دانانی فەنەر لە بۆریی زراودا. بەکەڵکبوونی **شیمۆڕادیاسیۆنتراپی** لە شێرپەنجەی کیسەی زیلکدا جارێ بە تەواوی ڕوون نەبووەتەوە و بەکارهێنانی ئەم دوو شێوەیە نەبووەتە هۆی درێژکردنەوەی ماوەی زیندوومانەوەی نەخۆش. بە گشتی، شێرپەنجەی کیسەی زیلک دوابینییەکی زۆر مەترسیداری هەیە و ماوەی زیندوومانەوەی نەخۆش بۆ ٥ ساڵ لە نێوان نزیکەی ٢٪ هەتا ١٠٪یە. لەو نەخۆشانەی کە پۆلیپی کیسەی زیلکیان لە ١ سانتیمەتر گەورەترە و بەردی زیلیکان لە ٣ سانتیمەتر گەورەترە، یان تووشی کالسیفیکاسیۆنی کیسەی زیلک بوون، بۆ پێشگیری لە شێرپەنجەی ئەم ئەندامە، کۆلیسیستەکتۆمی پێشنیاز دەکرێ. لە کۆلانژیۆکارسینۆمدا نەشتەرگەری تەنها شێوەی چاککەرەوەیە، هەرچەند لە کاتی دیاریکردنی شێرپەنجەدا کەمتر لە سێیەکی نەخۆشەکان بە هۆی پەرەسەندنی نەخۆشییەکەوە بۆ نەشتەرگەری نابن و لە کاتی دیاریکردندا تەنها ١٠٪ی نەخۆشەکان لە قۆناخە سەرەتاییەکانی ئەم نەخۆشییەدا بۆ نەشتەرگەری هەڵبژێرراون. ماوەی زیندوومانەوەی نەخۆش بۆ ٥ ساڵ پاش ڕێزەکسیۆنی

---

486 Open cholecystectomy

کۆلانژیۆکارسینۆمی نێو جگەر، دیستالکۆلانژیۆکارسینۆمی دەرەوەی جگەر و کۆلانژیۆکارسینۆمی ناوک (تومۆری کلاستکین)[487] بە ڕێز ٢٢٪ هەتا ٤٤٪، ٢٧٪ هەتا ٣٧٪ و ١١٪ هەتا ٤١٪ە. ماوەی زیندوومانەوەی نەخۆش لە پێوەندی لەگەڵ بڕین و جیاکردنەوەی تومۆردا (R1 یان R0)، هێرشی ڤاسکۆلاری یان میتاستاز بۆ لیمفەگرێکانە. ڕێزەکسیۆنی R0 و بوونی تومۆر لە پلەی "بە باشی جیاکراوە"دا، هەر کام سەربەخۆ لە پێوەندی لەگەڵ باشتربوونی ماوەی زیندوومانەوەی نەخۆشن، بەڵام تووشبوونی لیمفەگرێکان (٥٠٪ی نەخۆشەکان لە کاتی دیاریکردندا دەبینرێ) هۆی کورتکردنەوەی ماوەی زیندوومانەوەی نەخۆشە. چارەسەری نەخۆش لە ڕێگەی نەشتەرگەرییەوە لە پێوەندی لەگەڵ شوێن و پانتایی تومۆری بۆریی زراودایە. چارەسەری کۆلانژیۆکارسینۆمی نێو جگەر لە ڕێگەی ڕێزەکسیۆنی کەرت (سیگمێنت) یان ئەو لۆبەی جگەرە کە



تومۆری کلاستکین(کۆلانژیۆکارسینۆم لە ئاستی دوولقبوونی بۆریی هێپاتیک)

---

[487] Cholangiocarcinoma of the hilum(Klastkin tumor)

تووشــی شــێرپەنجە بووە. لە دیســتال کۆلانژیۆکارســینۆمدا کەڵک لە **پــانکریــاتۆدیۆدینەکتۆمی** وەردەگیرێ. **هێپــاتەکتۆمی گەورە**[488] بۆ دەرمانی تومۆری کلاستکین و تومۆری نێو جگەر بەکار دێ، هەرچەند ناشــێت هەڵبژاردەیەکی باش بێ بۆ ئەو نەخۆشـــە بەتەمەنانەی کە نەخۆشــیی دیکەشــیان هەیە. **چاندنی جگەر** لەم نەخۆشــانەدا زۆر بە دەگمەن و تەنها بۆ تومۆرەکانی پرۆکسیماله، ئەویش تا ڕادەیەکی کەم ئینديكاســـیۆنی هەیە. لە چاندنی جگەردا ســـەرهەڵدانەوەی خێرای نەخۆشـــی و ڕێژەی خراپ و کەمیی زیندوومانەوەی نەخۆش بینراوە. بەپێی لێکۆڵینەوەکان، ئەم ڕێژەیە لە کۆلانژیۆکارســـینۆمی نێو جگەردا ١٠٪ و لە کۆلانژیۆکارسینۆمی دەرەوەی جگەردا ٢٥٪ە.

**هەنگاوگەلی سوکناییدەر لەم نەخۆشانەدا بریتین لە:**

* **دانـانی فەنەر (ســـتـنـت)** لە ڕێگەی (ERCP)[489] یـان (PTC)[490] بۆ ئاسابیکردنەوەی ڕەوتی زراو.

* **شـــیمۆتراپی**. ڕێژەی کاردانەوەی لە ئاســـتێکی نزمدایە (٢٠٪ هەتا ٣٥٪). بۆ ئەم مەبەسـتە، دەکرێ کەڵک لە کاپیسـتیابین یان گیمسـیتابین هەروەهـا لە کۆی ئەم دەرمـانـانە وەربگیرێ. **بـەدیـل**: گیمســـیتـابین/ ئۆکسالیپلاتین.

* **فتۆدینـامیک تراپی**. شـــێوەیەکی ئەزموونیی خۆجێییە بۆ دەرمانی شـــێرپەنجە و ئێســـتا بۆ شـــێرپەنجەی ئەندامەکانی دیکەی دەزگای هەرســـکردن کەڵکی لێ وەردەگیرێ. فتۆدینامیک تراپی کاریگەرییەکی باشی لە ئاسابیکردنەوەی ڕەوتی زراو و باشترکردنی چۆنێتیی ژیانی ئەو نەخۆشانەدا هەیە کە تووشـی کۆلانژیۆکارسینۆمی بڵاو بوون کە بۆ نەشـــتەرگەری نابن، هەروەها بەپێی زانیارییەکانی لێکۆڵینەوەیەک،

488 Major hepatectomy
489 Endoscopic retrograde cholangiopanctratography
490 Percutaneous transhepatic cholangiography

مامناوەندی ماوەی زیندوومانەوەی گرووپێک لەو نەخۆشانەدا کە فتۆدینامیکترابی کراون، لە بەرامبەر ئەوانەدا کە نەکراون، زۆر باشتر بووە (٤٨٣ ڕۆژ لە بەرامبەر ٩٨ ڕۆژ).

* **رادیاسیۆنترابی**. جارێ هیچ بەڵگەیەک نییە بۆ کەڵکوەرگرتنی ڕۆتینیی ڕادیۆترابی پاش نەشتەرگەری یان لە کاتی هەبوونی تومۆرێک کە بۆ نەشتەرگەری نەبێ.

**دوابینی** ئەم نەخۆشییە زۆر خراپە و ماوەی زیندوومانەوەی ئەم نەخۆشانە بۆ ٥ ساڵ بە ڕێژەی ٥٪ە.

# سەرچاوەکان

1- David L. Bartlett, Ramesch K. Ramanthan and Edgar Ben-Josef. Cancer of the Biliary Tree. Cancer Principles & Practice of Oncology, Volume one. Lippincott, Wiliams&Wilkins, 8th Edition 2008

2- Johns Hopkins Pathology, 125dvanced125a125& Bile duct Cancer, http://pathology2.jhu.edu/bileduct/intro.cfm

3- G. Kornek, W. Schima, Gallenblasen – und Gallengangkarzinom, Die Onkologie, Hiddemann und Bartram, 2 auflage, Teil 2, Springer 2010

4- Mary Denshaw-Burke, MD, FACP؛ Chief Editor: Jules E Harris, MD more... Gallbladder Cancer, Updated: Apr 14, 2014, http://emedicine.medscape.com/article/278641-overview

5- Peter E Darwin, MD؛ Chief Editor: Jules E Harris, MD more... Cholangiocarcinoma, Updated: Mar 26, 2015, http://emedicine.medscape.com/article/277393-overview

6- Shahid A Khan und ... Duideline for the diagnosis and treatment of Cholangiocarcinoma: an update 15. Aug. 2012. Gut 2012؛61:1657-1669. Doi؛10.1136/gutjnl/-2011-301748

7- K.Beckh, Gallenblase und Gallenweg(Gallenblasenkarzinom& Cholangiozelluläre Karzinom) Gastroenterologie compact. Alles für Klinik und Praxis, Prof. Dr. Med. Karlheinz Beckh, Thema, 2013

8- Amy S. Oxentenko, MD, FACP, Editor, Assistant Professor of Medicine& ... MKSAP 16, Biliary Neoplasms Neoplasia p. 73, Gastroenterology and Hepatology. 2015, ACP, USA

9- Gerd Herold und Mitarbeiter, Tumoren der Gallenblase und Gallenwege, Innere Medizin, Köln 2015.

## بەشی شەشەم

## شێرپەنجەی ڕیخۆڵەباریکە[491]

### پەتاناسی

شـــێرپەنجەی ڕیخۆڵەباریکە یەکێکە لە شـــێرپەنجە دەگمەنەکانی دەزگای هەرسکردن و ١٪ هەتا ٢٪ی سەرجەمی شێرپەنجەکانی ئەم دەزگایە پێک دەهێنێ. بە گشـــتی، ڕادەی ســـەرهەڵدانی شـــێرپەنجەی ڕیخۆڵەباریکە لە وڵاتـانی ئـاســـیـایی و کەمتر پیشـــەســـازیدا بە بەراورد لەگەڵ وڵاتە ڕۆژئاواییەکان لە ئاســتێکی نزمدایە. دەگمەنبوون و هەروەها ســروشــتی ناتایبەتی و بگۆڕی ســـەرهەڵدانی نیشـــانەکانی ئەم شـــێرپەنجەیە بوونەتە هۆی دژواریی ڕەوتی دیـاریکردن و لە ئـاکـامـدا دەســـتنیشـــانکردنی لە قۆنـاخی پەرەگرتوو و بـاش دەرماننەکردنی شـــێرپەنجەی ڕیخۆڵەباریکە. ڕادەی ســـەرهەڵدانی شـــێرپەنجەی ڕیخۆڵەباریکە لە پیاواندا بە نیســـبەتی ژنـــان بەرزتر و ١,٤ بە ١-ە. بەپێی چوونەســـەرەوەی تەمەن، ڕەوتی بڵاوبوونەوەی شـــێرپەنجەی ڕیخۆڵەبـاریکە ڕوو لە زیـادبوون دەکـا و مـامنـاوەنـدی دیـاریکردنی ئەم نەخۆشـــییە لە نزیکەی ٦٠ ســـاڵیدایـە. مامناوەندی زیندوومانەوەی نەخۆشـەکان بۆ ٥ سـاڵ لە ئادنۆکارسـینۆمی ڕیخۆڵەباریکەدا ٣٠٪ هەتا ٣٥٪ و لە سارکۆمدا نزیکەی ٢٥٪ە.

---

491 Small intestine cancer

## هۆ و فاکتەرە مەترسیدارەکان

### فاکتەرە مەترسیدارەکانی ژێنێتیک

* پۆلیپۆز ئـانـادنۆمـاتۆزی بنەمـاڵەیی (میراتی)[492]: لەم حـاڵەتەدا لە ڕیخۆڵەبـاریکە و کۆلۆنی نەخۆشـــدا ئـادنۆمێکی زۆر پێـک دێن کە دەتوانن پاش پەرەسـەندنیان بگۆڕڕێن و ببن بە ئادنۆکارسـینۆم. پاش کۆلۆن، دوازدەگرێ باوترین بەشـــی سـەرهەڵدانی ئادنۆکارسـینۆمە. موتاسیۆنی ژێنی (APC)[493] فاکتەری مەترسیدارە بۆ پێکهاتنی پۆلیپۆز ئانادنۆماتۆزی بنەماڵەیی.

* شـێرپەنجەی ناپۆلیپۆزی کۆلۆرەکتاڵی میراتی: لەو نەخۆشـانەدا کە تووشـــی ئەم سـینـدرۆمە ژێنێتیکییە بوون، بێجگە لە کارســـینۆمی کۆلۆرەکتاڵ، وێچوونی ســـەرهەڵدانی کارســـینۆمەکانی ئێندۆمێتریال، گەدە، ڕیخۆڵەباریکە، بەشـــی ســـەرووی دەزگای میز و میزەڕۆ هەیە. باوترین ژێنگەلێک کە لە شێرپەنجەی ناپۆلیپۆزیی میراتی کۆلۆرەکتاڵدا تووشی موتاسیۆن دەبن، بریتین لە: HMLH1 و HMSH2.

### فاکتەرە مەترسیدارە ژینگەییەکان

* بەپێی بەشـــێک لە لێکۆڵینەوەکـان، لەوە دەچێ چەوریی حەیوانی، خواردنی گۆشـــتی ســـوور و چێشـــتی زۆرســـوێر یان بە دووکەڵ ئامادەکراو نەخشـــیان لە ســـەرهەڵدانی شـێرپەنجەی ڕیخۆڵەباریکەدا هەبێ.

* لە لێکۆڵینەوەیەکـدا لە ســـاڵی ١٩٩٤ی زایینی پێوەنـدیی نێوان جگەرەکێشـــان و خواردنەوەی ئەلکول لەگەڵ ســـەرهەڵـدانی ئادنۆکارسـینۆمی ڕیخۆڵەباریکە دیتراوە، بەڵام ئەمە لە توێژینەوەکانی دیکەدا نەسەلمێنراوە.

---

[492] Familial adenomatous polyposis

[493] Adenomatous polyposis coli

* لەوە دەچێ نەخۆشیی کرۆن (بە تایبەتی ٢٠ ساڵ پاش سەرهەڵدانی ئەم نەخۆشییە) مەترسییەک بێ بۆ سەرهەڵدانی ئادنۆکارسینۆمی ڕیخۆڵەباریکە.

* لەو کەسانەدا کە تووشی نەخۆشیی سیلیاک (سپرۆی نەترۆپیکاڵ)[٤٩٤] بوون، ڕادەی مەترسیی سەرهەڵدانی لیمفۆم و ئادنۆکارسینۆمی ڕیخۆڵەباریکە دەچێتە سەرێ.

* هۆی تومۆری ستروٚماڵ نادیارە و ڕادەی سەرهەڵدانی لە چەشنی یەکی نۆیرۆفیبرۆماتۆز لە سەرەوەیە. لەم کەسانەدا موتاسیۆنی وەرگرەکانی تیرۆزین پرۆتین کینازی کیت[٤٩٥] (لە نزیکەی ٩٠٪ی بوارەکاندا) یان (PDGFR-α)[٤٩٦] (٥٪) بەرچاو دەکەوێ.

* لەو کەسانەدا کە تووشی سیندرۆمی پویتز جێگیرز بوون، مەترسیی سەرهەڵدانی شێرپەنجەی ڕیخۆڵە ١٥ قات لە خەڵکی ئاسایی بەرزترە.

ڕیخۆڵەباریکە و ئەندامە درواسییەکان




494 Non-Tropical Sprue
495 Tyrosine-protein kinase Kit
496 Alpha-type platelet-derived growth factor receptor

## قەوارە و کاری ڕیخۆڵە باریکە

ڕیخۆڵەباریکە درێژترین بەشـی لوولەی هەرس بە درێژایی ٤،٧٥ **هەتا** ٦ مەترە و دوو لە سـێی درێژایی ئەم لوولەیە پێک دەهێنێ. تیرەی[٤٩٧] ڕیخۆڵەباریکە ٢،٥ سـانتیمەترە و نیوەکەی لێرەوە سـەرچاوە دەگرێ (تیرەی ڕیخۆڵەگەورە ٦ سـانتیمـەترە) بە هۆی نوشـتـانەوەی ڕیخۆڵەباریکە بە سـەر خۆیدا، پانایییەکی نزیک بە ٧٠٠٠ سانتیمەتر بۆ دەلاندن و ڕاکێشانی مەواد (کەرەستەکان) پێک دێ.

**ڕیخۆڵەباریکە لە ڕوانگەی پێکهاتەییەوە** بۆ سێ بەش دابەش دەکرێ:

* **دیودینۆم**[٤٩٨] یان دوازدەگرێ (بەشـی سـەروو)، درێژایی ئەم بەشـە ٢٥ سانتیمەترە.

* **ژێژیونوم** یان ڕیخۆڵەی ڕۆژوان، (گرنجەڕیخۆڵە) (بەشـی ناوەندی یان نیوەڕاست) و درێژییەکەی ٢،٥ مەترە.

* **ئیلیـال** یـاخود درێژەڕیخۆڵە (لۆغـانەتی ڕیخۆڵەبـاریکە) (بەشـی خواروو یان کۆتایی کە بە زمانەی ئیلیۆسـێکال[٤٩٩] پێوەسـت دەبێ) کە درێژییەکەی ٣،٦ مەترە.

زمانەی ئیلیۆسـکال تەسـکییەکە کە چوونی ئاخنراوی ڕیخۆڵەباریکە بۆ نێو سـکۆم (ڕیخۆڵەکوێرە)[٥٠٠] کونترۆڵ دەکـات و پێشـگیری لە گەڕانەوەی بـاکترییەکـان بۆ نێو ڕیخۆڵەبـاریکە دەکـا. ئـاپـانـدیس (زێدەگۆشتی کلێنچکەی ڕیخۆڵەکوێرە)[٥٠١] بە سکۆمەوە نووساوە.

---

497 Diameter
498 Duodenum
499 Ileocecal Valve
500 Cecum
501 Appendix

چینەکانی ڕیخۆڵە باریکە




## چینەکانی دیواری ڕیخۆڵەباریکە

ڕووبەری ژوورەکیی ڕیخۆڵەباریکە بە هۆی لە قامک لێچوونی[٥٠٢] پەردەی موکۆس[٥٠٣] کە پێیان دەگوترێ برژانگ[٥٠٤] (پرز، مەمیلە، گەندەموو) حاڵەتی مەخمەڵی یان قەیفەیی[٥٠٥] هەیە. ئەم برژانگانە پانتایی ڕووبەری ڕیخۆڵەباریکە زۆر دەکەن و بەم پێیە یاریدەی ڕەوتی هەڵمژینی چێشتی هەرسکراو دەدەن.

**توێخی ژوورەکیی ڕیخۆڵەباریکە لە چوار چین پێک هاتووە:**

* **موکۆس** (پەردەی موکۆس).

* **سابموکۆس** (تان و پۆی هاوبەست، ڕەگەکان، لیمفەکان و دەمارەکان لە خۆ دەگرێ).

* **موسکولاریس** (موسکولاریس پرۆپریا)، ئەم چەشنە ماسوولکە سافە یاریدەی جووڵانەوە و بەرەوپێشڕادانی چێشتی خوراو لە نێو ڕیخۆڵە دەدەن.

---

502 Finger-like
503 The mucous membrane
504 Villi
505 Velvety

* **سرۆز** (سابسرۆز)، ناسکترین چینی دەرەکیی ڕیخۆڵەباریکەیە.
کار و ئەرکی سەرەکیی ڕیخۆڵەباریکە هەرسکردن و هەڵمژینی مادەی خوراوی وەکو ئەلیکترۆلیت، ڤیتامین و کانزاییەکانە[506]. ڕیخۆڵەباریکە گرنگترین ئەندامی دەزگای هەرســــکردنە. نزیکەی ٩٠٪ی هەڵمژینی مادەی خوراو لە ڕیخۆڵەباریکەدا ڕوو دەدا.

## پاتۆلۆژی

ڕیخۆڵەباریکە نزیکەی ٧٥٪ی دەزگای هەرســــکردن و ٩٠٪ی پانتایی هەڵمژینی مادەی خوراو لە خۆ دەگرێ. سەرەڕای ئەوەش، شێرپەنجەی ڕیخۆڵەباریکە تەنها نزیکەی ١٪ هەتا ٢٪ی تەواوی شــــێرپەنجەکانی دەزگای هازیمە پێک دەهێنێ. ئەو شــــێرپەنجانە کە لە ڕیخۆڵەباریکەدا ســـەرهەڵدەدەن، بریتین لە: ئادنۆکارســـینۆم، کارســـینۆید، لیمفۆم[507] و ســــارکۆمەکان. ڕادەی ســــەرهەڵدانی چەشــــنەکانی هیســــتۆلۆژیکی شێرپەنجەی ڕیخۆڵەباریکە بە هۆی بەرزبوونەوەی ڕادەی سەرهەڵدانی کارســــینۆید تووشــــی گۆڕان هاتووە. لە ســــاڵی ١٩٨٧ی زایینی ئادنۆکارســـینۆم ٤٥٪ی شـێرپەنجەکانی ڕیخۆڵەباریکەی پێک دەهێنا و باوترین چەشـنی هیسـتۆلۆژیکی بوو. کارسـینۆید ٢٩٪، لیمفۆم ١٦٪ و ســـارکۆم ١٠٪ی شــێرپەنجەکانی ڕیخۆڵەباریکەیان لە خۆ دەگرت. لە ســــاڵی ٢٠٠٠دا ڕادەی ســــەرهەڵدانی تومۆرەکانی کارســــینۆید، ئادنۆکارسینۆمیان وەپاش خست و لە لایەن بنکەی زانیاریی نەتەوەیی

[506] Minerals
[507] Lymphoma



تەشەنەی کارسینۆمی بۆریی سییەکان لە ژژیونوم(گرنجە ڕیخۆڵە)

کانسەر[508]ەوە وەکو باوترین چەشنی شێرپەنجەی ڕیخۆڵەباریکە پێناسە کران. لە نێوان ساڵەکانی ١٩٨٥ هەتا ٢٠٠٥ ڕێژەی نەخۆشەکانی کارسینۆید ٢٨٪ بە ٤٤٪ و ڕێژەی ئادنۆکارسینۆم لە ٤٢٪ بە ٣٣٪ گەیشتن. ڕێژەی نەخۆشەکانی تومۆری سترۆمال (١٧٪) و لیمفۆم (٨٪) سەقامگیر مانەوە. ڕادەی سەرهەڵدانی شێرپەنجەی ڕیخۆڵەباریکە نزیکەی ٤٠ هەتا ٦٠ قات کەمترە لە تومۆرەکانی ڕیخۆڵەگەورە. لەوە دەچێ هۆی کەمبوونی ڕێژەی شێرپەنجەی ڕیخۆڵەباریکە بەپێی لێکۆڵینەوەکان و تیۆرییە جوراوجۆرەکان بەم چەشنە بێ:

١. بە هۆی ئەوەی کە تراو زۆرترین بەشی ئاخنراوی نێو ڕیخۆڵەباریکە پێک دەهێنێ، خێراترین ماوەی تێپەڕبوونی[509] هەیە. ئەمە دەبێتە هۆی دابەزینی کات بۆ کاریگەریی مادەگەلێک کە پۆتانسیەلی پێکهێنانی شێرپەنجەیان هەیە.

---

508 National Cancer Data Base (NCDB)

509 Transit

٢. PHی ڕیخۆڵەباریکە مەیلی بەرەو بێلایەنی[510] یان قەڵیاییبوونی[511] هەیە، ئەمە دەبێتە هۆی دابەزینی بارودۆخ بۆ ئەسـیدیبوونی[512] نێو ڕیخۆڵەباریکە. ئەسیدیبوون باشترین حاڵەتە بۆ چالاکیی کارسینۆژینەکان[513].

٣. بـاکترییەکـانی نێو ڕیخۆڵەبـاریکە کەمتر نـاهەوایین[514] و بەم پێیە کەمتر ڕێخۆشـــکەری لێکهەڵوەشـــانەوەی خوێی زیلکن، بەشـــێک لە توێژەرەکان لەو باوەڕەدان کە ناهەواییەکان لە کۆلۆندا کارسینۆژینن.

٤. ڕیخۆڵەباریکە وەرگرێکی زۆری بۆ ڕاکێشـــانی فۆلات[515] هەیە و بە باوەڕی بەشـێک لە لێکۆڵەرەکان، بەرزبوونی ئاسـتی فۆلات نەخشـی بەرگریی لە بەرامبەر کارسینۆژینەکان هەیە.

٥. ڕیخۆڵەبـاریکە بێنزۆپێرین هیـدرۆکســـیلازێکی[516] زۆری هەیە کە دەبێتە هۆی لێکهەڵوەشـــانی بێنزۆپێرین. بێنزۆپێرین مـادەیەکە کە پۆتـانســـیەلی کارسینۆژینی هەیە و لە خواردەمەنییەکاندا کەڵکی لێ وەردەگرن.

٦. ڕیخۆڵەباریکە تان و پۆی لیمفۆید[517] و بە تایبەتی ئیمۆنۆگلوبۆلینی A-یەکـی[518] زۆری هەیە و لەوە دەچـێ ئەمـانە ڕۆڵـی بەرگـریـی ئەیمەنییان بۆ پێشگیری لە پێکهاتنی شێرپەنجە هەبێ.

٧. ڕادەی خانە بنەماییەکانی[519] ڕیخۆڵەباریکە لە ئاستێکی نزمدایە، بەم پێیە، لەودا کەمتر وێچوونی پێکهاتن و پەرەگرتنی شێرپەنجە هەیە.

**پۆلبەندیی TNMی شێرپەنجەی ڕیخۆڵەباریکە**

**T –تومۆری سەرەتایی**

**TX** تومۆری سـەرەتایی بۆ هەڵسـەنگاندن نابێ.

---

[510] Neutral
[511] Alkaline
[512] Acidic
[513] Carcinogen
[514] Anaerobic
[515] Folate
[516] Benzopyrene hydroxylase
[517] Lymphoid tissue
[518] Immunoglobulin A
[519] Stem cells

**T0** تومۆری سەرەتایی دیاری ناکرێ.
**Tis** کارسینۆم لە جێدا.
**T1** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە لامینا پرۆپریا یان سابموکۆسدا.
**T2** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە موسکولاریس پرۆپریادا.
**T3** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە ڕێگەی موســـــکولاریس پرۆپریا لە نێو ســـابســـرۆز یان تان و پۆی مێزەنتەری[٥٢٠] یان ڕەترۆپریتەنیۆم[٥٢١] بە درێژایی کەمتر لە ٢ سانتیمەتر.
**T4** بڵاوبوونەوەی تومۆر بۆ نێو ڤیســـراڵ پریتەنیۆم (هەناوپۆش) یان ڕاستەوخۆ بۆ نێو ئەندام یان پێکهاتەکانی دیکە.

## N –لیمفەگرێ ناوچەییەکان

**NX** لیمفەگرێ ناوچەییەکان بۆ هەڵسەنگاندن نابن.
**No** نیشانەیەک لە مێتاستازی لیمفەگرێ ناوچەییەکان نابینرێ.
**N1** ســـــەرهەڵـدانـــی مێتاســـتاز لە لیمفەگرێ ناوچەییەکان.

## M –مێتاستازی دوور

**MX** مێتاســتازی دوور بۆ هەڵسەنگاندن نابێ.
**M0** مێتاســتازی دوور نابینرێ.
**M1** ســـــەرهەڵــدانـــی مێتاستازی دوور.


ئادنوکارسینومی ریخولەباریکە لەگەل تومورەخانەکانی ئەموستیلەی مور (ئەستیرە
لە نیوان بوشایی موکوسی ریخولەدا

520 Mesentery
521 Retroperitoneum

## قۆناخەکانی کارسینۆمی ڕیخۆڵەباریکە

| | |
|---|---|
| 0 | Tis/N0/M0 |
| قۆناخی I | T1-2/N0/M0 |
| قۆناخی II | T3-4/N0/M0 |
| قۆناخی III | /N1/M0 هەر کام لە T-کان |
| قۆناخی IV | هەر کام لە N-ەکان/ هەر کام لەT-یەکان /M1 |

### نیشانەکان

لە قۆناخە سەرەتاییەکاندا نیشانەیەکی وەها نابینرێ، بەڵام لە ٩٠٪ی نەخۆشەکاندا لەوە دەچێ نیشانەکان بەپێی پەرەسەندنی نەخۆشییەکە سەرهەڵبدەن. بە هۆی سروشتی ناتایبەتی نیشانەکانەوە، مامناوەندی کاتی دواکەوتنی نێوان سەرهەڵدانی نیشانەکان و دیاریکردن زۆر جار ٦ هەتا ٨ مانگە. نیشانە باوەکانی ئەم نەخۆشییە بریتین لە دڵتێکهەڵهاتن، ڕشانەوە و گیرانی ڕیخۆڵە.[522] نیوەی نەخۆشەکان بە هۆی گیرانی ڕیخۆڵەوە پێویستیان بە نەشتەرگەریی لەناکاو و خێرا دەبێ. هەروەها لەم کەسانەدا سکئێشە و دابەزینی نائاسایی قورسایی لەش دەبینرێ، بەڵام خوێنبەربوونی ڕیخۆڵە زۆر باو نییە. لە ئادنۆکارسینۆمدا، بە بەراورد لەگەڵ سارکۆمەکان و کارسینۆید، زۆرتر ئێش و گیران یاخود بەسترانی ڕیخۆڵە دەبینرێ. لە سارکۆمەکان (سترۆمال)دا خوێنبەربوونی دەزگای هەرسکردن باوترە.

---

522 Intestinal obstruction

## دیاریکردن

### تاقیکردنەوەی خوێن

* دیتنی نیشـانەکانی ئانیمی لە کاتی تاقیکردنەوەی ڕێژەی سـەرجەمی خانەکانی خوێندا وەک ئاکامی خوێن لەدەستدانی درێژخایەن. هەروەها لەوە دەچێ هیپێربیلی ڕوبینێمیی[523] (بە هۆی بەسـتـرانی بۆریی زیلک وەکو ئاکامی تومۆرەکانی دەوری ئامپۆلی واتەر[524])، چوونەسەرەوەی ڕادەی ترانسـئامینازەکان[525] لە کاتی مێتاسـتازی جگەر، هەروەها چوونەسەرەوەی ئانتیژێنی (دژەتەنی) کارسینۆئەمبریۆنیکدا[526] ببینرێ.

* لە **ئێندسکۆپی** بەشی سەرووی دەزگای هەرسکردن بە بەکارهێنانی **ئێنترسـکۆپی ڕیخۆڵەباریکە**[527] بۆ دەسـتنیشـانکردنی شـوێنی نموونەگرتن، کەڵـک لە تومۆر و تـان و پۆی دیودینۆم و ژێژیونوم وەردەگیرێ.

* **کۆلۆسکۆپی لەگەڵ ڕەترۆگراد (گەڕاوەبەرەودوا) ئیلیۆسکۆپی**[528] یاریدەی دیاریکردنی تومۆرەکانی ئیلیال دەدا.



ستروماتوموری ژژیونوم(GIST)

* **کەپسـولئێندسـکۆپی**.[529] لەم تـاقـیـکـردنەوەیەدا کەڵـک لە کەپسـوولێکی ١١X٢٦ میلیمەتریی بە قـورسـایـی ٤ گـرام کە دووربینێکی ڤـیـدیۆیی[530] چکۆلە، بـاتری و بنێری فرێکـانسـی

523 Hyperbilirubinemia
524 Periampullary tumors
525 Transaminase
526 Carcinoembryonic antigen
527 Small-bowel enteroscopy (push enteroscopy)
528 Retrograde ileoscopy
529 Capsule endoscopy
530 Video camera

ڕادیۆیی[531] هەیە، وەردەگیرێ. باترییەکە ٨ کاژێر دەوام دەهێنێ و لە کاتی تێپەڕبوون بە دەزگای هەرسکردندا نزیکەی ٥٠٠٠٠ وێنە دەگرێ و یاریدەی دیاریکردنی هەر چەشــنە برین و تومۆر و... بە تایبەتی لە ڕیخۆڵەبــاریکەدا دەدا. بەکــارهێنــانی ئەم تــاقیکردنەوەیە لە کــاتی تەنگبوونی لوولەی ڕیخۆڵەدا کۆنترائیندیکاسیۆنی هەیە.

* بۆ دەستنیشانکردنی شوێنی نیوە یان تەواوبەستراوی ڕیخۆڵەباریکە کەڵک لە **ڕادیۆگرافیی سک** وەردەگیرێ. لە ٥٣٪ هەتا ٨٣٪ی بوارەکاندا **ڕادیۆگرافی بە قووتدانی باریۆم** گۆڕانی نائاســـایی ڕیخۆڵەباریکە دەستنیشان دەکا.

* **کامپیۆتێرتۆمۆگرافی و وێناکردنی زرنگانەوەی موگناتیسیی سک و کۆجیلەی ســمت (لەگەن، کاســیلکە)** یاریدەی هەڵســەنگاندنی ڕەوتی خۆجێیی نەخۆشییەکە، هەروەها تەشەنەکردنی بۆ جگەر و ئەندامەکانی دیکەی نێو سک دەدا. بۆ دیاریکردنی تەشەنەی شێرپەنجە بۆ سییەکان و ڕکەی سینگ، کەڵک لە کامپیوتێرتۆمۆگرافیی سینگ وەردەگیرێ.

* ئەمڕۆکە ڕادەی بەکــارهێنــانی **تۆمۆگرافیی تەواوی جەســـتە بە دەردانی پۆزیترۆنەوە** بۆ دیــاریکردن و هەڵســـەنگــاندنی تومۆر و قۆناخەکانی شێرپەنجە تا ڕادەیەک زیادی کردووە و پلەی هەستیاری بۆ کارسینۆماتۆزی پەردەی سک بە ڕێژەی ٥٠٪یە.

* هەروەهــا ئەمڕۆ **لاپراســـکۆپی** بووەتە بەشــێک لە شـــێوەی هەڵســـەنگــاندنی قۆنــاخی شــــێرپەنجە و ڕوونکردنەوەی وێچوونی ڕێزەکســـیۆنی تومۆر پێش دەســـتپێکی دەرمــان. هۆی بنچینەیی بۆ قۆنــاخبەنــدیی لاپراســـکۆپی لەخوارەوەبوونی پلەی هەســـتیــاریی کامپیوتێرتومۆگرافییە بۆ دەســـتنیشـــانکردنی میتاســـتازگەڵێک کە ئەنــدازەیــان ٥ میلیمــەتر و کەمترە. لاپراســـکۆپی هەل و دەرفەتی ڕاســـتەوخۆ بۆ تێڕوانین، بە وردی ســـەیرکردن و تێڕوانینی ڕووی پەردەی سک و هەناو دەڕەخسێنێ.

---

531 Radiofrequency transmitter



هیستولوژیی ستروماتوموری دەزگای هەرسکردن

## دۆزراوەکانی هیستۆلۆژیک

هیستۆلۆژی یاریدەی جیاکردنەوەی چەشنەکان و قۆناخی شێرپەنجە دەدا.

* **ئادنۆکارسینۆمەکان** (٤٠٪).
- پلەی **I** یان بە باشی جیاکراوە ٤٢٪ - سفر.
- پلەی **II** یان تا ڕادەیەک جیاکراوە[532] ٤٥٪ — ٢٤.
- پلەی **III** یان بە باشی جیانەکراوە ٤٢٪ - ٣٤.
* **سارکۆمەکان** GISTs/ (١٥٪)

**ڕەنگکردنی هیســـتۆشـــیمیـــایی** نیشـــــانەکەرێکی گرینگـــە بۆ ســـترۆماتومۆرەکانی دەزگای هەرســـکردن (GIST).[533] بەپێی ڕاپۆرتی "**میتینین**" و هاوکارەکانی، ڕادەی ڕەنگکردنی هیســـتۆشـــیمیایی بەپێی شـــوێنە جیاوازەکانی ئاناتۆمیک لە ئاســـتێکی بەرامبەردا نییە. بۆ وێنە، ئەو لێکۆڵینەوانەی لەسەر ٢٩٢ کەس کراون، نیشـانیان داوە کە ڕادەی

---

532 Moderately differentiated

533 Gastrointestinal stromal tumor

CD34 و ئاكتینی ماســـوولكەی ســـاف[٥٣٤] لە ئاســـتێكی بەرامبەردان.
سەرەڕای ئەوەش لە GISTsدا كە سەرچاوەی گەدە، كۆڵۆن و ڕەكتۆم بووە، ١٠٠٪ بۆ CD34 ئەرێنی بووە، بەڵام بۆ ئاكتینی ماســـوولكەی ســـاف وا نەبووە. تەنها ٥٠٪ی GISTs ڕیخۆڵەباریكە بۆ CD34 ئەرێنی بووە.

* كارسینۆیدەكان (٣٠٪).
* لیمفۆمەكان (١٥٪).

## چارەسەر

**نەشـــتەرگەری** تەنها هیوای چارەســـەرە لە ئادنۆكارســـینۆمی ڕیخۆڵەباریكەدا. وێچوونی ئەم كارە تەنها لە نزیكەی دوو لە ســـێی نەخۆشـــەكاندا هەیە، واتە بەپێی زۆربەی لێكۆڵینەوەكان، وێچوونی **ڕێزەكسیۆنی چاككەرەوە** لە نزیكەی ٤٠٪ هەتا ٦٥٪ی بوارەكاندایە. لە نەخۆشـەكانی دیكەدا وێچوونی ڕێزەكسـیۆنی تومۆر بە هۆی پانتایی نەخۆشیی خۆجێیی[٥٣٥] یان تەشەنەكردنی تومۆر لە زۆربەی لیمفەگرێ ناوچەییەكان و دوور یان جگەر و ڕووبەری پریتەنیۆم[٥٣٦]دا نییە. لە تومۆرەكانی ژێژیونوم و بەشـی پرۆكسـیمالی ئیلیۆم **ڕێزەكسـیۆنی گەورەی خۆجێیی**[٥٣٧] لەگەڵ **لیمفئادنئەكتۆمی**، نەشـتەرگەریی دڵخوازە. بۆ تومۆری بەشـــی دیســـتالی ئیلیۆم، كەڵك لە **ئیلیۆكۆلئەكتۆمی**[٥٣٨] وەردەگیرێ. لەوانەی كە تووشـی شـێرپەنجەی بەشـی پرۆكسـیمالی دیودێنوم و ناوچەی پریئامپولار[٥٣٩] بوون، نەشـتەرگەری لە چەشـنی **پـانكراتیكۆدیودێنئەكتۆمییە**، لەم حـاڵەتەدا ڕێژەی مردن بە هۆی نەشتەرگەری لە ٥٪ كەمترە. بەشێكی زۆر لە لێكۆڵینەوەكان نیشانیان داوە كە ڕێژەی زیندوومانەوەی ئەو نەخۆشانەی نەشتەرگەری كراون،

---

534 Smooth muscle actin
535 Extensive local disease
536 Peritoneal surface
537 Extensive local disease
538 Ileocolectomy
539 Periampullary region

٤٠٪ هەتا ٦٠٪ باشتر بووە. هەروەها نەشتەرگەری بۆ سوکنایی نیشانەکانی پەرەگرتووی ئەم نەخۆشییە وەکو بەسترانی ڕێگەی ڕیخۆڵە بەکار دەبرێ. سەرەڕای بەکەڵکبوونی ئیماتینیب[540] بۆ دەرمانی ستڕۆماتومۆرەکانی دەزگای هەرسکردن، ڕێزەکسیۆنی نەشتەرگەری وەکو چارەسەریی سەرەکی بۆ سارکۆمی ڕیخۆڵەباریکە دەمێنێتەوە، ئەگەرچی لە ٣٥٪ هەتا ٥٠٪ی بوارەکاندا وێچوونی نەشتەرگەری بە هۆی میتاستازەکان نییە. ڕێزەکسیۆنی سارکۆمی ڕیخۆڵەباریکەش هەر وەکو ئادنۆکارسینۆمی ڕیخۆڵەباریکە لە ڕێگەی پانکراتیکۆدیودێنێەکتۆمیە. **هێمیکۆڵێەکتۆمی بەشی ڕاست**[541] لە کاتی نزیکبوونی تومۆرەکانە لە زمانەی ئیلیۆسیکال.

## ڕادیاسیۆنترایی

* سەرەڕای ئەوەی کە **ڕادیۆترایپی یاریدەدەر** کاریگەرییەکی بەکەڵکی پاش نەشتەرگەریی ئادنۆکارسینۆم یان سارکۆمی ڕیخۆڵەباریکە نەبووە، لەوە دەچێ وەکو هەنگاوێکی سوکناییدەر کاریگەریی هەبێ لە هێدیکردنی ئێش یاخود نیشانەکانی گیرانی ڕێگەی ڕیخۆڵە لە کاتی پەرەسەندنی شێرپەنجەدا. هەروەها وێدەچێ ڕادیۆترایی لە ڕەوتی کۆنترۆڵی تومۆری درێژخایەن لە پێوەندی لەگەڵ لەدەستدانی خوێن کاریگەرییەکی باشی هەبێ.

* ئەگەرچی نیشان دراوە کە ڕادیۆترایی کاریگەریی لەسەر باشترکردنی کۆنترۆڵی خۆجێیی سارکۆمی دەست و قاچەکان بووە، بەڵام ڕۆڵی لە سارکۆمەکانی دەزگای هەرسکردندا جارێ بە تەواوی ڕوون نییە. لێکۆڵینەوە لە سەر ڕۆڵی **براکیترایپی یاریدەدەر**[542] و **ڕادیاسیۆن لە کاتی نەشتەرگەری**[543]دا بۆ چارەسەرکردنی سارکۆمی دەزگای هەرسکردن کراوە.

---

540 Imatinib
541 Right hemicolectomy
542 Adjuvant brachytherapy
543 Intraoperative radiation

تا ئێستا هیچ ڕژیمێکی ستاندارد کاریگەرییەکی بەکەڵکی لە چارەسەری ئادنۆکارسینۆمی ڕیخۆڵەباریکە نیشان نەداوە، لەوە دەچێ کەڵک لە دەواگەلێکی وەکو 5-FU لەگەڵ Leucovorin وەربگیرێ. لە پێوەندی لەگەڵ **شیمۆتراپی،** کارسینۆمی تەشەنەکراو یان سەرهەڵدانەوەی تومۆری ڕیخۆڵەباریکە، هەروەها تومۆرێک کە بۆ نەشتەرگەری نەبێ، جارێ لێکۆڵینەوەیەکی وەها لە بەردەستدا نییە.

# سەرچاوەکان

1- James C Cusack, Jr, MD& … Epidemiology, clinical features, and types of small bowel neoplasms, Literature review current through: Apr 2015. | This topic last updated: Jan 18, 2015.http://www.uptodate.com/contents/epidemiology-clinical-features-and-types-of-small-bowel-neoplasms?source=see_link

2- Ponnandai S Somasundar, MD, FACS; Chief Editor: Jules E Harris, MD more… Malignant Neoplasms of the Small Intestine, Updated: Dec20, 2013.http://emedicine.medscape.com/article/282684-overview#showall

3- Anatomy and physiology of the small intestine, http://www.cancer.ca/en/cancer-information/cancer-type/small-intestine/anatomy-and-physiology/?region=bc

4- Herbert J. Zeh, III and Michael Federle, Cancer of the Small Intestine, Section 9, DeVita, Hellman, and Rosenberg's Cancer, Princeples & Practice of Oncology, Volume One, 8th edition, Lippncott Williams&Wilkins 2008

5- Thomas M Attard, MD, FAAP, FACG; Chief Editor: Julian Katz, MD more… Peutz-Jeghers syndrome (PJS), Updated: Mar 6, 2015. http://emedicine.medscape.com/article/182006-overview

6- Alfred I Neugut, M.D., Michael R Marvin, Ph.D., M.D., and John A Chabot, M.D., Adenocarcinoma of the small bowel, http://www.ncbi.nlm.nih.gov/books/NBK6933/

7- Neugut AI[1], Jacobson JS, Suh S, Mukherjee R, Arber N. The epidemiology of cancer of the smallbowel.Cancer Epidemiol Biomarkers Prev. 1998 Mar;7(3):243-51. http://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/9521441

8- Delaunoit T, Neczyporenko F, Limburg PJ, Erlichman C, (2004) Small bowel adenocarcinoma : a rare but aggressive disease. Clin.Colorectal cancer 4: 241-248

9- Gnant M, Schlag PM, (Hersg.) Chirurgische Onkologie (2008) Springer-Verlag/Wien, S:260-268

10- Jemal A, siegel R, Ward E, Murray T, Xu J, Smigal C, Thun MJ, (2006)Cancer statistics , 2006 Ca Cancer J Clin. 56: 106-130

11- Meneghetti AT, Safadi B, Stewart L, Way LW, (2005) Local resection of ampullary tumours. J Gastrintest Surg. 9: 1300-1306

12- Paramythiotis D, Kleeff J, Witz M, 142dvan H, Büchler MW (2004) Still any role for trnsduodenal local excision in tumors of the papillaof Vater?J Hepatobiliary pancreat Surg 11: 239-244

13- R. Hofheinz , S. Frick: Dünndarmkarzinom ,In:W. Dornoff, F. G. Hagemann, J. Preiß, A. Schmieder(Hrsg): Taschenbuch Onkologie2010 zuckschwerdt Verlag 2010 S. 102 H.-J. Schmoll, K. Höfken , K. Possinger (Hrsg) Kompendium Intmistische Onkologie,Springer Verlag 2006
14- Stolte M, Pscherer C, (1996) Adenoma-carcinoma sequence in the papilla of Vater. Scand J Gastroentrol 31: 376-382.

# بەشی حەوتەم

## شێرپەنجەی کۆلۆرەکتاڵ[544]

### پەتاناسی

شێرپەنجەی کۆلۆرەکتاڵ لە جیهاندا سێیەمین شێرپەنجەی باوە لە نێو شێرپەنجەکاندا (١٢٣٠٠٠٠ کەس لە ساڵ) و چوارەمین هۆی مردنە (٦٠٨٠٠٠ کەس لە ساڵدا). ڕادەی سەرهەڵدانی لە پیاواندا بە بەراورد لەگەڵ ژنان بەرزترە (١:١,٤). زۆرترین ڕێژەی سەرهەڵدانی ئەم نەخۆشییە لە ئوستراليا و نیوزیلاندە و نزمترین ڕێژەی سەرهەڵدانی لە ڕۆژئاوای ئەفریقایە. لە ئەمەریکا شێرپەنجەی کۆلۆرەکتاڵ سێیەمین شێرپەنجەی باوە و هۆی مردنی ژنان و پیاوانە. لە ولاتانی ئورووپاییدا ئەو ڕادەیە بەپێی ولاتەکان جۆراوجۆرە، بۆ وێنە، لە یۆنان کەمتر لە ٢٠ و لە ئەڵمان سەرەوەی ٤٠ لە هەر ١٠٠٠٠٠ کەسە لە ساڵدا و لە پیاواندا پاش کارسینۆمی سییەکان و لە ژناندا پاش کارسینۆمی مەمک، دووەمین هۆی مردنی نەخۆشەکانی شێرپەنجەیە. لە ٩٠٪ی بوارەکاندا کارسینۆمی کۆلۆرەکتاڵ پاش ٥٠ ساڵی سەرهەڵدەدا، هەرچەند لە کەسانێکدا پێش ٤٠ ساڵییش دیتراوە. ڕێژەی سەرهەڵدانی کارسینۆمی کۆلۆرەکتاڵ پاش ٤٠ ساڵی، هەر ١٠ ساڵ دووقات دەبێتەوە.

---

544 Colorectal cancer

له ئێراندا شـــێرپەنجەی کۆلۆرەکتاڵ چوارەمین شـــێرپەنجەیە پاش شێرپەنجەی پێست، مەمک و گەدە. بەپێی ئەو ئامارانە کە لەبەردەستدان، شـــێرپەنجەی کۆلۆرەکتاڵ لە نێوان ســـاڵەکانی ١٣٨٦-١٣٨٢ی هەتاوی ٧،٤٪ی تەواوی شێرپەنجەکانی ئەم وڵاتەی پێک هێناوە.

## هۆ و فاکتەرە مەترسیدارەکان

**١. فاکتەری ژنێتیکی** (١٠٪ی بوارەکاندا).

* پۆلیپۆز ئادنۆماتۆزی بنەماڵەیی هۆی ١٪ی تەواوی کارسینۆمەکانی کۆلۆرەکتاڵە.
* بەسەرهاتی بنەماڵەیی کارسینۆمی کۆلۆرەکتاڵ.
* سیندرۆمی لینچ (سیندرۆمی شێرپەنجەی کۆلۆرەکتاڵی ناپۆلیپۆزی میراتی).

**٢. فاکتەری ژینگەیی**

* کەمخواردنی فیبەر[545]، خواردنی چەوری و گۆشـــتی زۆر و بە تایبەتی گۆشـــتی ســـوور، قەڵەوی و خواردنەوەی زۆری ئەلکول، هەروەها جگەرەکێشانی درێژخایەن نەخشیان لە سەرهەڵدانی شێرپەنجەی کۆلۆرەکتاڵدا هەیە. خواردنەوەی ٣٠ گرام یان زۆرتر ئەلکول لە ڕۆژدا مەترســـی سەرهەڵدانی شێرپەنجەی کۆلۆرەکتاڵ بە ڕێژەی ٢٥٪ بەرز دەکاتەوە.
* خواردنی سەوزی، میوە و فیبەر، دانەوێڵە (دەخڵودان)، ڤیتامین C و ئەســـید فۆلیک و کالســـیۆم و چالاکیی بەردەوامی لەش، هەروەها دەواگەلێکی وەکو ئاسپرین، دژهەوەکانی نەسترۆییدی و 5-ASA (لە کاتی نەخۆشـــیی کۆلیت ئولســـێرۆزا[546]) لەوانەیە پێشـــگیری لە سەرهەڵدانی شێرپەنجەی کۆلۆرەکتاڵ بکەن.

**٣. نەخۆشییە ڕێخۆشکەرەکان**

* ئادنۆمی کۆلۆرەکتاڵ.

---

[545] Fiber
[546] Ulcerative colitis

* نەخۆشــیی هەو-درێژخایەنی ڕیخۆڵە[٥٤٧] وەکو کۆلیت ئۆلسـێرۆزا و نەخۆشیی کرۆن[٥٤٨]، ئورێترۆسیگمۆیدۆستۆمی[٥٤٩] کارسینۆمی مەمک، هێلکەدان و ئیندۆمێتریۆم (کۆرپوس ئوتێری)[٥٥٠]، هەروەها نەخۆشـــیی شەکرە لە چەشنی دوو و شیستۆزۆمیاز (یاوی شەیتانۆکە)[٥٥١] هۆی بەرزکردنەوەی مەترسیی شێرپەنجەی کۆڵۆرەکتاڵن. بۆ وێنە، لەوانەی ئورێترۆســیگمۆیدۆســـتۆمی کراون، مەترســـیی ســـەرهەڵدانی ئەم شـــێرپەنجەیە لە ١٠٠ هەتا ٥٠٠ کەڕەت بەرزترە لە خەڵکی ئاســـایی، هەروەهـا لە نەخۆشـــەکانی شـــەکرەدا بە بەراورد لەگەڵ ئەوانەی نەخۆشیی شەکرەیان نییە، ئەم مەترسییە بە ڕێژەی ٣٠٪یە.




**٤. هۆی نادیار.**

**قەوارە و کـــاری ڕیخۆڵەگەورە**

ڕیخۆڵەگەورە بەشـــی کـۆتـایــی دەزگـای هەرســـــکردنە و لە کــــۆتـــایـــی ڕیخۆڵەبـاریکەدا، واتە لە ئیلیۆمەوە دەســـت پێ دەکا و هەتا کۆم درێژەی هەیە. درێژیی ڕیـــخـــۆڵەگەورە یەک

---

[547] Chronic inflommatory bowel disease
[548] Crohn disease
[549] Ureterosigmoidostomy
[550] Endometrial cancer, *Carcinoma corporis uteri*
[551] Schistosomiasis

مەتر و نیوە و ئەم بەشانە لە خۆ دەگرێ:

* **سەیکۆم** (ڕیخۆڵەکوێرە) یان سەرەتای ڕیخۆڵەگەورە کە ئاپاندیسی پێوە لکاوە.

* **کۆلۆنی بەرەو ژوور**[552].

* **کۆلۆنی ئاسۆیی**.

* **کۆلۆنی بەرەوخوار**[553].

* **سیگمۆید**[554]، لە بەشی کۆتایی کۆلۆنی بەرەوخوار دەست پێ دەکا و هەتا سەرەتای ڕێکەڕیخۆڵە[555] درێژەی هەیە.

* **ڕەکتۆم** یاخود ڕێکەڕاستە (ڕیخۆڵەی ڕاست) لە کۆتایی سیگمۆیدەوە دەست پێ دەکا و هەتا تەسکییەکانی (سفینکتەرەکانی)[556] کۆم درێژەی هەیە و نزیکەی ١٢ هەتا ١٦ سانتیمەترە و لە ڕوانگەی ئاناتۆمیکەوە بۆ سێ بەش دابەش دەکرێ:

- یەک لە سێی سەروو، واتە ١٢ هەتا ١٦ سانتیمەتر لە ئاستی کۆمەوە.
- یەک لە سێی نێوەڕاست، واتە ٧،٥ هەتا ١٢ سانتیمەتر لە ئاستی کۆمەوە،
- یەک لە سێی خواروو، واتە ٣،٥ هەتا ٧،٥ سانتیمەتر لە ئاستی کۆمەوە.

**کاری ڕیخۆڵەگەورە** ڕاکێشانی ئاو و خوێ و ڕامالینی کەرەستەی ناپێویستی لەش (پیسایی)ە بەرەو کۆتایی دەزگای هەرسکردن و دەرەوەی لەش.

---

[552] Ascending colon
[553] Descending colon
[554] Sigmoid colon
[555] Rectum
[556] Sphincter

# چینەکانی دیواری ڕیخۆڵەگەورە

ڕیخۆڵەگەورە وەکو زۆربەی بەشەکانی دیکەی دەزگای هەرسکردن لە چوار چین پێک هاتووە: **موکۆس، سابموکۆس، موسکولاریس پرۆپریا و سرۆز.** موکۆس پێکهاتەیەکە لە ئیپیتەلیومی کۆڵەکەیی[557] و ڕێژەیەکی زۆر لە خانەکانی گۆبلێتە (پەرداخ)[558] کە کاریان دروستکردن و دەڵاندنی موکۆسە، هەروەها لامینا پرۆپریا و موسکولاریس موکۆس. سابموکۆس ڕەگەکانی خوێن و تۆڕە دەمارەکانی مەیسنێر[559] لە خۆ دەگرێ. موسکولاریس پرۆپریا پیکهاتەیەکە لە خڕە (گلۆرە) ماسوولکەکانی ژوورەکی و درێژیی دەرەکی،[560] هەروەها تۆڕە دەمارەکانی ئاوێرباخ[561]. سرۆزی کۆلۆن لە ڕاستیدا هەر پریتەنیۆمی ڤیسراڵە.



ئادنۆکارسینۆمی ڕیخۆڵە گەورە، ڕەخنەی ڕژێنە نائاساییەکان (ئەستێرەکان)لە پەردەی سوب موکۆسدا

557 Columnar epithelium
558 Goblet cells
559 Meissner nerve plexus
560 Inner circular and outer longitudinal muscles
561 Myenteric (Auerbach) nerve plexus

بە گشتی، شێرپەنجەی کۆلۆڕەکتاڵ نەخۆشییەکی ئاڵۆزە و گۆڕانکاریی ژنیتیکیی زۆرتر لە پێوەنـدی لەگەڵ پەرەسـەنـدنی تـومۆری پێشـشـێرپەنجەیی[٥٦٢] (ئادنۆم) بە ئادنۆکارسـینۆمی هێرشـبەرە. زنجیرەیەک لە ڕووداوە ژنیتیکییەکان دەبنە هۆی ترانسفۆرماسیۆنی[٥٦٣] پۆلیپی ئـادنۆمـاتۆز[٥٦٤] بە شـێرپەنجە. موتـاسـیۆنی ژێنی پۆلیپۆز ئادنۆماتۆز (APC)[٥٦٥] ڕووداوێکی پێشوەختە لەم ڕەوتەدا و بۆ هەوەڵ جـار لەوانەدا کە تووشـی پۆلیپۆز ئـادنۆمـاتۆزی بنەمـاڵەیی بوون، دیتراوە. ئەو پرۆتینە کە APC کۆدیرەی[٥٦٦] دەکـا، ڕۆڵێکی گرینگی لە چـالاککردنی ئۆنکۆژێن[٥٦٧]ی c-myc و cyclin D1دا هەیە، ئەم ئۆنکۆژێنـانە دەبنە هۆی پەرەسـەندنی فێنۆتیپەکانی[٥٦٨] شـێرپەنجە. هەرچەنـد پۆلیپۆز ئـادنۆمـاتۆزی بنەمـاڵەیی سـیندرۆمێکی دەگمەنی میراتییە و هۆی نزیکەی ١٪ی شـێرپەنجەی کۆلۆنە، بەڵام ڕێژەی موتاسـیۆنی ژێنی پۆلیپۆز ئادنۆماتۆز لە شـێرپەنجەی سـپورادیکی کۆلۆڕەکتـاڵ[٥٦٩] گەلێـک زۆرترە. زیـادە لە موتـاسـیۆن، لەوە دەچێ ڕووداوەکانی ئێپیژنێتیک[٥٧٠] وەکو "متیلاسـیۆنی (DNA)[٥٧١] نائاسـایی" هۆی کوژانەوەی (خامۆشـبوونی)[٥٧٢] ژێنە سـەرکوتکەرەکانی تومۆر یـاخود چالاککردنی ئۆنکۆژێنەکـان بێ. ئەم ڕووداوانە هـاوسـەنگیی ژنێتیکیی تێک دەدەن و دەبنە هۆی ترانسـفۆرماسـیۆنێکی خەسـاردەر. کارسـینۆژێنەکانی دیکەی کۆلۆن بریتیین لە: ئۆنکۆژێنی K-ras، ژێنی

---

[562] Premalignant lesion
[563] Transformation
[564] Adenomatous polyps
[565] Adenomatous polyposis gene
[566] Encoded
[567] Oncogene
[568] Phenotype
[569] Sporadic colorectal cancers
[570] Epigenetic events
[571] DNA methylation
[572] Silencing

سەرکوتکەری تومۆر وەکو بیتاکاتنین، SMAD4 (DPC4)[٥٧٣] و DCC و p53. کۆمەڵێک لە شێرپەنجەی کۆلۆرەکتاڵ لە پێوەندی لەگەڵ "کەمایەسیی ژێنەکانی چاککەرەوەی ناتەبایی DNA"[٥٧٤] دیاری دەکرێ. ئەم فینۆتیپە لە پێوەندی لەگەڵ موتاسیۆنی ژێنگەلێکی وەکو MSH2, MLH1، هەروەها PMS2دایە. ئەم موتاسیۆنانە دەبنە هۆی سەقامنەگرتوویی مایکرۆسەتەلایتەکان[٥٧٥] (وردەتەنە ئاسمانییەکان) بە ئاستێکی بەرزەوە. H-MSI نیشاندەری سەرەکیی سیندرۆمی شێرپەنجەی کۆلۆرەکتاڵی ناپۆلیپۆزی میراتییە[٥٧٦] و ٦٪ی تەواوی شێرپەنجەکانی کۆلۆن پێک دەهێنێ. هەروەها H-MSI لە نزیکەی ٢٠٪ی شێرپەنجەکانی سپۆرادیکی کۆلۆن دەبینرێ. رێژەی شوێنی سەرهەڵدانی شێرپەنجەی کۆلۆرەکتاڵ بەم چەشنەیە: رێکەرێخۆڵە (٥٠٪)> سیگما (٣٠٪)> سەیکۆم/ کۆلۆنی بەرەو ژوور (١٠٪)> لە شوێنەکانی دیکەی کۆلۆندا (١٠٪).



هیستولوژیی شێرپەنجەی رەکتوم

[573] Deleted in colon cancer
[574] Deficient DNA mismatch repair
[575] Microsatellite instability
[576] Hereditary nonpolyposis colon cancer syndrome

**لە ڕوانگەی هیســتۆلۆژیکییەوە شــێرپەنجەکانی کۆلۆڕەکتاڵ بەم چەشنەن:**

* ئادنۆکارسینۆم (٨٥٪ هەتا ٩٠٪).
* ئادنۆکارسینۆم موسینی (کالوئید) (١٠٪).
* کارسینۆمی خانە پوولەکەدارەکان (سکواموس)، ئادنۆسکواموس و خانە بچووکەکان (٢٪).

**بەپێی مەترسیداریی شێرپەنجە، چوار پلە جیا دەکرێتەوە:**

* **G1** بە باشی جیا کراوەتەوە.
* **G2** تا ڕادەیەک جیا کراوەتەوە.
* **G3** باش جیا ناکرێتەوە.
* **G4** جیا ناکرێتەوە (کارسینۆمی خانە بچووکەکان).

**مەترسیی شێرپەنجە بەپێی پلەبەندیی WHO:**

* بە پلەی نزمەوە (G1/G2).
* بە پلەی بەرزەوە (G3/G4)

**پۆلبەندیی TNMی شێرپەنجەی کۆلۆڕەکتاڵ (UICC 2010)**

**T –تومۆری سەرەتایی**

**TX** تومۆری سەرەتایی بۆ هەڵسەنگاندن نابێ.

**T0** تومۆری سەرەتایی دیاری ناکرێ.

**Tis** کارســـینۆم لە جێدا: نێو ئێپیتەلیاڵ[577] یاخود بڵاوبوونەوە لە لامینا پرۆپریادا.

**T1** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە سابموکۆسدا.

**T2** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە موسکولاریس پرۆپریادا.

---

[577] Intraepithelial

**T3** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە ڕێگەی موسکولاریس پرۆپریا لە نێو تان و پۆی تەنیشتی کۆلۆڕەکتاڵدا.
**T4a** بڵاوبوونەوەی تومۆر بۆ نێو ڤیسراڵ پریتەنیۆم (هەناوپۆش).
**T4b** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە پێکهاتە یان ئەندامەکانی دیکەدا.

**N–لیمفەگرێ ناوچەییەکان**

**NX** لیمفەگرێ ناوچەییەکان بۆ هەڵسەنگاندن نابن.
**No** نیشانەیەک لە مێتاستازی لیمفەگرێ ناوچەییەکان نابینرێ.
**N1** سەرهەڵدانی مێتاستاز لە ١ هەتا ٣ لیمفەگرێی ناوچەیی.
**N1a** سەرهەڵدانی مێتاستاز لە ١ لیمفەگرێی ناوچەیی.
**N1b** سەرهەڵدانی مێتاستاز لە ٢ هەتا ٣ لیمفەگرێی ناوچەیی.
**N1c** هەبوونی گرێی تومۆر لە تان و پۆی چەوریی سابسرۆز یاخود تان و پۆی چەوریی دەوری کۆلۆن و ڕەکتۆم بەبێ تەشەنەکردنی بۆ لیمفەگرێ ناوچەییەکان.
**N2** سەرهەڵدانی مێتاستاز لە ٤ یان زۆرتر لە ٤ لیمفەگرێی ناوچەییدا.
**N2a** سەرهەڵدانی مێتاستاز لە ٤ هەتا ٦ لیمفەگرێی ناوچەییدا.
**N2b** سەرهەڵدانی مێتاستاز لە ٧ و زۆرتر لە ٧ لیمفەگرێی ناوچەییدا.

**M– مێتاستازی دوور**

**M0** مێتاستازی دوور نابینرێ.
**M1** سەرهەڵدانی مێتاستازی دوور.

## قۆناخەکانی کارسینۆمی کۆلۆڕەکتاڵ

| | |
|---|---|
| 0 | Tis/N0/M0 |
| قۆناخی I | T1/N0/M0 |
| | T2/N0/M0 |
| قۆناخی IIA | T3/N0/M0 |
| قۆناخی IIB | T4a/N0/M0 |
| قۆناخی IIC | T4b/N0/M0 |
| قۆناخی IIA | T1-T2/N1–N1c/M0 |
| | T1/N2a/M0 |
| قۆناخی IIB | T3-T4a/N1/N1c/M0 |
| | T2-T3/N2a/M0 |
| | T1-T2/N2b/M0 |
| قۆناخی IIIC | T4a/N2a/M0 |
| | T3-T4a/N2b/M0 |
| | T4b/N1-N2/M0 |
| قۆناخی Iva | -/ هەر کام لە T-یەکان<br>هەر کام لە Nەکان/M1a |
| قۆناخی Ivb | -/ هەر کام لە T-یەکان<br>هەر کام لە Nەکان/M1b |

## قۆناخبەندیی شێرپەنجەی کۆلۆرەکتاڵ لە لایەن کۆمیتەی هاوبەشی شێرپەنجەی ئەمەریکاوە[578]

| ڕێژەی زیندوومانەوەی نەخۆش بۆ نزیکەی ٥ ساڵ | شیکردنەوە | قۆناخ |
|---|---|---|
| لە ٩٠٪ هەتا ٩٥٪ | تومۆر لە نێو تەواوی ئەستووریی دیواری ڕیخۆڵەدا (T1, T2) بڵاو نەبووەتەوە؛ تومۆر تەشەنەی بۆ لیمفەگرێکان نەکردووە (N0). | I |
| ٧٠٪ هەتا ٨٥٪ | تومۆر لە نێو تەواوی ئەستووریی دیواری ڕیخۆڵەدا بڵاو بووەتەوە و لەوە دەچێ لە چەوریی دەوری کۆلۆن و ڕەکتۆمدا تەشەنەی نەکردبێ (T3, T4)، تومۆر تەشەنەی بۆ لیمفەگرێکان نەکردووە(N0). | II |
| ٢٥٪ هەتا ٧٠٪ | یەک یان پتر لە یەک لیمفەگری تووشی شێرپەنجە بووە (N1-N2)، لەوە دەچێ هەر کام لە قۆناخەکانی T ببینرێ. | III |
| ٠٪ هەتا ١٠٪ | تەشەنەی دووری تومۆر دەبینرێ (M1)؛ لەوە دەچێ هەر کام لە قۆناخەکانی T و N ببینرێن. | IV |

---

[578] American Joint Committee Of Cancer

## نیشانەکان

بە داخەوە، لە قۆناخە سەرەتاییەکاندا نیشانەیەکی وەها نابینرێ، بەڵام لە کاتی پەرەسەندنی شێرپەنجەدا نیشانە باوەکان بریتین لە کەمخوێنیی ئاسن (١١٪)، خوێنبەربوونی ڕەکتاڵ یان هەبوونی خوێن لە پیسایيدا (٤٠٪)، گۆڕانی کتوپڕی عادەتی چوونەئاودەست، وەکو جێگۆڕکێی قەبزی و سکچوون (١٣٪)، هەستکردن بە ماندوێتی و لاوازی (٢٠٪)، بێئیشتیایی، دابەزینی نائاسایی قورسایی لەش (٦٪)، سکئێشە (٤٣٪)، گیرانی ڕیخۆڵە و کونبوونی ڕیخۆڵە. کاتێک تومۆر لە بەشی چەپی ڕیخۆڵەدا بێ، لەوە دەچێ زۆرتر خوێنبەربوون و سکچوون ببینرێ، بەڵام لە تومۆری بەشی چەپ کە درەنگتر دیاری دەکرێ، زۆرتر گیرانی ڕیخۆڵە سەرهەڵدەدا.

## دیاریکردن

بەپێی بێنیشانەبوونی شێرپەنجەی کۆڵۆڕەکتاڵ لە قۆناخی سەرەتاییدا، **چاودێریکردن** نەخشێکی گەورەی لە دیاریکردنی گۆڕانکاری و نەخۆشییە ڕێخۆشکەرەکانی وەکو پۆلیپەکانی ئادنۆماتۆزی کۆڵۆن هەیە. دابەزینی ڕێژەی سەرهەڵدان و مردنی نەخۆش بە هۆی شێرپەنجەی کۆڵۆڕەکتاڵ لە چەند دەیەی ڕابوردوودا تا ڕادەیەکی زۆر لە پێوەندی لەگەڵ چاودێریی نەخۆشدایە. ڕێکارنامەی زانستگای گاستڕۆئێنترۆلۆژیی ئەمەریکا پاش گەیشتنی مرۆڤ بە ٥٠ ساڵ، لەوانەی کە نیشانەی شێرپەنجەیان نییە، پێشنیازی جارێک **کۆڵۆسکۆپی** لە هەر دە ساڵدا دەکا. لە ١٥٪ی بوارەکاندا، لە تێڕوانینی ڕێکەڕیخۆڵە بە قامک هەست بە بوونی تەواوی تومۆرەکان دەکرێ. لە تەواوی ئەو کەسانەدا کە نیشانەکانی شێرپەنجەی کۆڵۆڕەکتاڵیان هەیە، پێویست بە کۆڵۆسکۆپییە. شوێنی نزیکەی ٥٠٪ی ئادنۆم و شێرپەنجەکانی کۆڵۆڕەکتاڵ نێوان ڕەکتۆم و گۆشەی (کونجی) سپڵە،

سەرەڕای ئەوەش لە ژنان و نەخۆشە بەتەمەنەکاندا شوێنی سەرەکیی سەرهەڵدانی شێرپەنجە بەشی پرۆکزیمالی کۆڵۆنە. پێش نەشتەرگەری، **کامپیوتێرتومۆگرافی سک و کۆجیلەی سمت (لەگەن، کاسیلکە)** پێویستە بۆ هەڵسەنگاندنی پانتایی مێتاستاز. لەوە دەچێ **وێناکردنی زرنگانەوەی موگناتیسی و کامپیوتێرتومۆگرافی بە دەردانی پۆزیترۆنەوە** یاریدەی دیاریکردنی مێتاستاز لەم نەخۆشانەدا بدا. بۆ دیاریکردنی تەشەنەی شێرپەنجە بۆ سییەکان و قەفەسەی (ڕکەی) سینگ، کەڵک لە کامپیوتێرتومۆگرافیی سینگ وەردەگیرێ. پێش نەشتەرگەری، **ئێندۆسۆنۆگرافی (ئێندسکۆپیکسونۆگرافی)** پێویستە بۆ قۆناخبەندیی شێرپەنجە. بەپێی قۆناخی شێرپەنجە لە بەشێک لە نەخۆشەکاندا بەرزبوونەوەی ئاستی بنەمایی **ئانتیژێنی کارسینوئامبریۆنیک** دەبینرێ. ئەم نیشانەکەرە تایبەتمەند نییە بە تومۆر و وەکو تاقیکردنەوەیەکی پێشوەخت پێناسە ناکرێ. بایەخی ئەم نیشانەکەرە زۆرتر لە شوێنگرتنی پاش نەشتەرگەریی ڕادیکاڵدایە: پاش بڕین و جیاکردنەوەی تەواوی تومۆرەکە، ڕادەی بەرزیی پێش نەشتەرگەریی ئانتیژێنی کارسینوئامبریۆنیک ئاسایی دەبێتەوە، بەڵام لە کاتی سەرهەڵدانەوەی تومۆردا دیسان بەرز دەبێتەوە. لەبەر ئەوە، پێشنیاز دەکرێ پاش نەشتەرگەری ئەم نیشانەکەرە بەردەوام تاقی بکرێتەوە. ئامانجی **تاقیکردنەوەی خوێن** [وەکو ڕێژەی سەرجەمی خانەکانی خوێن، ئانزیمەکانی جگەر و هتد...] لێکدانەوەی کاری ئەندامەکانی وەکو جگەر و گورچیلە و کارتێکەری و کاردانەوەی شێرپەنجەیە لەسەر ئەم ئەندامانە.

## چارەسەر

ڕادەی زیندوومانەوەی نەخۆش لە پێوەندی لەگەڵ قۆناخی نەخۆشییەکەدایە (بڕوانە خشتەی قۆناخبەندیی شێرپەنجەی کۆلۆرەکتاڵ لە لایەن کۆمیتەی هاوبەشی شێرپەنجەی ئەمەریکاوە). بە

داخەوە، شێرپەنجەی ٤٥٪ی نەخۆشەکان کاتی هاتنیان بۆ لای پزیشک لە قۆناخی **III** و **IV**دایە. نەشتەرگەری تەنها لە قۆناخی سەرەتاییدا دەتوانێ هۆی چارەسەری یەکجاری بێ.

## نەشتەرگەری

نەشتەرگەری تەنها شێوەی چاککەرەوەی شێرپەنجەی خۆجێیی (قۆناخی I-III)، هەروەها لە کاتی تەشەنەی بەستراوە لە جگەر و/ یان سییەکاندایە (قۆناخی IV). بنەواشەی گشتی بۆ تەواوی شێوەکانی نەشتەرگەری بریتییە لە بڕین و لابردنی تومۆری سەرەکی بە لێوارێکی شیاو[٥٧٩] و لەخۆگرتنی ناوچەی دریناژی لیمفەکانە[٥٨٠]. لە تومۆری جێگیر لە سەیکۆم و کۆلۆنی ڕاستدا هێمیکۆلێکتۆمی ڕاست ئیندیکاسیۆنی هەیە. لە کاتی هێمیکۆلێەکتۆمی ڕاستدا بەشەکانی ئیلیۆکۆلیکی ڕاست[٥٨١]، کۆلیکی ڕاست و لقی ڕاستی ڕەگەکانی نێوەڕاستی (ناوەندی) کۆلیک[٥٨٢] پاش جیاکردنەوە، لادەبرێ. پێویستە بۆریی میزیی[٥٨٣] ڕاست، ڕەگی هێلکەدانەکان یان گون، هەروەها دوازدەگرێ بە باشی دیاری بکرێن. کاتێک ئۆمێنتۆم بە تومۆرەوە لکابێ، پێویستە ئەم بەشە بە تەواوی (en bloc) لابرێ و نموونەی لێ هەڵبگیرێ. نەشتەرگەریی تومۆرەکانی بەشی پرۆکزیمال یان ناوەڕاستی کۆلۆنی ئاسۆیی لە ڕێگەی هێمیکۆلێەکتۆمی ڕاست بە پانتاییەکی گەورەیە. لەم حاڵەتەدا ئیلیۆکۆلیک، کۆلیکی ڕاست و ڕەگە ناوەندییەکانی کۆلیک پاش جیاکردنەوە و نموونەهەڵگرتن لەگەڵ

579 Adequate margins
580 Lymphatic drainage
581 Ileocolic
582 Middle colic vessels
583 Ureter




مێزەنتەر (ڕیخۆڵەبەند) لادەبرێن. لە کاتی هەبوونی تومۆری جێگیر لە چەمی سپڵ[٥٨٤] یان کۆلۆنی چەپدا کەڵک لە شێوەی هێمیکۆلێەکتۆمی چەپ وەردەگیرێ. لەم حاڵەتەدا لقی چەپی ڕەگە ناوەندییەکانی کۆلیک، خوێنهێنەری خوارووی مێزەنتەریک و ڕەگەکانی کۆلیکی چەپ لەگەڵ مێزەنتەرەکانیان لادەبرێن، هەروەها نموونەیان لێ هەڵدەگیرێ. **سیگمۆید کۆلێەکتۆمی** شێوەی هەڵبژاردە بۆ نەشتەرگەریی تومۆری

584 Splenic flexure

ســیگمۆیده، خوێنبەری میزەنتەریکی خواروو لە ســەرچاوەکەی جیا دەکرێتەوە و دیســێکســیۆن ڕوو بە لەگەن (کۆجیلەی ســمت) هەتا پێکهێنانی لێوارێکی شــیاو درێژەی دەبێ. لە کاتی دیســێکســیۆندا پێویســتە بۆریی میزیی چەپ و ڕەگەکانی هێلکەدان و گونی چەپ دیاری بکرێن.

لەوە دەچێ **کۆلئەکتۆمی تەواو**[585] لەگەڵ **ئاناستۆمۆزی ئیلیۆڕەکتاڵ**[586] لە نەخۆشەکانی خوارەوەدا لەبەرچاو بگیرێ:

* سیندرۆمی شێرپەنجەی کۆلۆڕەکتاڵی ناپۆلیپۆزی میراتی.
* سیندرۆمی تەختەئادنۆمی بنەماڵەیی[587].
* هەبوونی چەندین تومۆری سەرەکی لە سیگمێنتەکانی کۆلۆندا[588].

لەوە دەچێ کۆلئەکتۆمی تەواو بۆ ئەو نەخۆشانە کە تووشی گیرانی کتوپڕ و مەترسیداری کۆلۆن بوون و لەواندا بارودۆخی بەشی پرۆکزیمالی ڕیخۆڵە نادیارە، ئیندیکاسیۆنی هەبێ. نەشتەرگەری لە ئادنۆکارسینۆمی ڕەکتۆم لە پێوەندی لەگەڵ قۆناخ، ئەندازە و شوێنی شێرپەنجەدایە. لەوە دەچێ **نەشتەرگەریی**



کارسینۆمی ڕەکتۆم

---

585 Total colectomy
586 Ileorectal anastomosis
587 Hereditary flat adenoma syndrome
588 Metachronous cancers in separate colon segments

**سنووردار** (بەستراوە) وەکو **بڕین و لابردنی خۆجێیی** (لە ڕێگەی ترانس ئانال[589]، ترانس سفینتەریک[590] و پۆستەریۆر پاراساکرال[591]) بۆ شێرپەنجەکانی ڕووپەری[592] (T0/T1) و بچووک (کەمتر لە ٣ سانتیمەتر)، هەروەها ئەو نەخۆشانە کە تووشی ئادنۆکارسینۆمی دیستالی ڕەکتاڵ یان لە چەشنی ناهێرشبەرانە بوون، کارێکی شیاو بێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، لە بەشێکی زۆر لە نەخۆشەکاندا بەپێی تەشەنەکردنی تومۆرەکان لە قووڵایی دیواری ڕەکتۆم **نەشتەرگەری بە پاراستنی سفینکتەر**[593] یان **ڕێزەکسیۆنی ئابدۆمینۆپرینیال**[594] پێویستە. لە تومۆری پەرەگرتووی خۆجێییدا کە شێرپەنجە بە تەنیشتە پێکهاتەکانەوە نووساوە یان جێگیر بووە (وەکو سێبەندە - سمتەجووڵەیی[595]، دیوارەکانی (کۆجیلەی سمت، پرۆستات یان میزەڵدان) ڕێزەکسیۆن بە پانتاییەکی زۆرتر پێویستە.

**نەشتەرگەری و شیمۆدەرمانیی یاریدەدەر** لەگەڵ ٥-فلوئۆروئوراسیل و لەیکوورین[596] لەگەڵ یان بەبێ ئۆکسالیپلاتین[597] یان کەپسیتابین[598] بە تەنها لە قۆناخی IIIدا پێشنیاز دەکرێ. لە قۆناخەکانی II و III پێکهاتەی **تیشکدەرمانیی پاش نەشتەرگەری** و ٥-فلوئۆروئوراسیل (لەگەڵ یان بەبێ لەیکوورین) بە چەشنێکی بەرچاو ڕادەی سەرهەڵدانەوە، مردن بە هۆی شێرپەنجە و مردن بە گشتی کەم دەکاتەوە. بەبێ لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی لیمفەگرێکان، تیشک و شیمۆدەرمانیی پێش نەشتەرگەری و بە شوێنی ئەودا شیمۆدەرمانیی

---

589 Transanal
590 Transsphincteric
591 Posterior parasacral
592 Superficial
593 Sphincter-sparing procedure
594 Abdominoperineal resection
595 Sacrum
596 Leucovorin
597 Oxaliplatin
598 Capecitabine

یاریدەدەر لە کاتی پەرەسەندنی خۆجێیی شێرپەنجەی ڕەکتۆمدا پێشنیاز دەکرێ. لە قۆناخی IVدا **نەشتەرگەریی سوکناییدەر**، شیمۆدەرمانی و / یان تیشکدەرمانی شێوەی سەرەکییە بۆ دەرمانی ئەم نەخۆشانە. لە کۆلۆرەکتالی تەشەنەکردوو **پۆلیشیمۆتراپی** لەگەڵ ٥-فلوئۆرۆئوراسیل یان پێشدەوای[599] کەپیسیتابین لەگەڵ ئۆکسالیپلاتین (یان ئیرینۆتیکان[600]) دەبێتە هۆی زۆرکردنی مامناوەندی ماوەی زیندوومانەوەی نەخۆش بۆ پتر لە ٢٠ مانگ. ئامانجی دەرمانی یاریدەدەر لەناوبردنی میکرۆمیتاستازەکان، دابەزاندنی ڕێژەی میتاستازی دوور، زۆرکردنی ماوەی زیندوومانەوە و کەمکردنەوەی ڕادەی مردنی نەخۆشە. لە شێرپەنجەی کۆلۆرەکتاڵدا بەپێی قۆناخ و پەرەسەندنی تومۆر کەڵک لە ڕژیمی جۆراوجۆر وەردەگیرێ. خشتەی شیمۆدەرمانیی خوارەوە وێنەیەکە لە شیمۆدەرمانی لە قۆناخی III بە تووشبوونی لیمفەگرێکانەوە.

## شیمۆدەرمانیی باو لە شێرپەنجەی کۆڵۆن لە قۆناخی III و تووشبوونی لیفەگرێکاندا

| | | |
|---|---|---|
| بە درێژایی ٢ کاژێر لە ڕۆژی یەکەم و لە ڕێگەی خوێنهێنەرەوە | Oxaliplatin 130 mg/m$^2$ | ڕژیمی Cape OX |
| دوو کەرەت لە ڕۆژدا بۆ ماوەی ١٤ ڕۆژ و لە ڕێگەی خواردنەوە | Capecitabine 850-1000mg/m$^2$ | |
| ئەم ڕژیمە هەر ٣ حەوتوو دووپات دەبێتەوە. | | |

599 Prodrug
600 Irinotecan

| | | |
|---|---|---|
| ڕژیمی Folfox-6 | Oxaliplatin 85 mg/m² | ڕۆژی یەکەم، بە درێژایی ٢ کاژێر لە ڕێگەی خوێنهێنەرەوە |
| | Leucovorin 400 mg/m² | ڕۆژی یەکەم، بە درێژایی ٢ کاژێردا |
| | 5FU 400 mg/m² | لێدانی خێرا لە ڕێگەی خوێنهێنەرەوە لە ڕۆژی یەکەمدا |
| | 5FU 2400 mg/m² | ئینفوزیون لە ڕێگەی خوێنهێنەرەوە بە درێژایی ٤٦ کاژێر لە ڕۆژەکانی یەکەم و دووەمدا |
| ئەم ڕژیمە هەر دوو حەوتوو دووپات دەبێتەوە. | | |
| ڕژیمی Capecitabine | Capecitabine 850-1250 mg/m² | دوو کەرەت لە ڕۆژدا بۆ ماوەی دوو حەوتوو لە ڕێگەی خواردنەوە، پاشان حەوتوویەک پشوو دەدرێ |
| ئەم ڕژیمە هەر ٣ حەوتوو دووپات دەبێتەوە. | | |
| ڕژیمی Roswell park | Leucovorin 500 mg/m² | بە درێژایی ٢ کاژێر لە ڕێگەی خوێنهێنەرەوە |

| | | |
|---|---|---|
| بە خێرایی و کاژێریک پاش لیدانی لەیکۆورین | 5FU 500 mg/m$^2$ | |
| ئەم دەوایانە حەوتوانە و بۆ ماوەی ٦ حەوتوو بەردەوام بە نەخۆش دەدرێن | | |
| ئەم ڕژیمە هەر ٨ حەوتوو دووپات دەبێتەوە. | | |
| بۆ ماوەی ٢ کاژێر لە ڕۆژی هەوەڵ جار لە ڕێگەی خوێنهێنەرەوە | Leucovorin 400 mg/m$^2$ | ڕژیمی میدیفییە 5FU/LV ($SLV_5$ 5FU 2) |
| بۆلوس لە ڕۆژی یەکەم و پاشان | 5FU 400 mg/m$^2$ | |
| ئینفیوژن بۆ دوو ڕۆژ | 5FU 1200 mg/m$^2$ | |
| ئەم ڕژیمە هەر ٢ حەوتوو جارێک دووپات دەبێتەوە. | | |
| بۆلوس حەوتوانە، بۆ ماوەی ٦ حەوتوو | 5FU 500 mg/m$^2$ | ڕژیمی Flox |
| حەوتوانە بۆ ماوەی ٦ حەوتوو | Leucovorin 500 mg/m$^2$ | |
| لە حەوتووەکانی ١ و ٣ و ٥ | Oxaliplatin 85 mg/m$^2$ | |
| کەڵکوەرگرتن لە ڕژیمی سەرەوە هەر ٨ حەوتوو و بۆ ٣ دەورەیە. | | |

بۆ هەڵبژاردنی ڕژێمی شیاو، پێویستە سەرنج لە خاڵەکانی خوارەوە لە پێوەندی لەگەڵ بەراوردکردنی ڕژێمەکانی ناوبراو لە سەری بدرێ.
لە "ڕژێمی Flox" لە بەراورد لەگەڵ "ڕژێمی Folfox"، سکچوونی توند کە دەشێ هەڕەشەیەک بێ بۆ گیانی نەخۆش، دەبینرێ، بەڵام "ڕژێمی Folfox" باشترە لە "ڕژێمی Flox " و جیاوازییەک لە باری کاریگەرییەوە لە نێوان ئەو دوو ڕژێمەدا نابینرێ.
بۆ هەڵسەنگاندنی "ڕژێمی 5FU/LV " و "ڕژێمی Capeox"، ٩٢٦ نەخۆش کە کەڵکیان لە ڕژێمی هەوەڵ وەگرتبوو، لەگەڵ ٩٣٩ نەخۆش کە کەڵکیان لە ڕژێمی دووەم وەرگرتبوو، بەراورد کراون، لە نەخۆشەکانی "گرووپی Capeox"دا ڕادەی سەرهەڵدانی سکچوون و تووکوەرین (ئالۆپیسی) کەمتر بوو، بەڵام لەواندا ڕادەی سەرهەڵدانی نورۆپاتی، دڵتێکهەڵهاتن، ڕشانەوە و سیندرۆمی دەست و لاق[٦٠١] بەرزتر بوو.
لە بەراوردکردنی "ڕژێمی 5FU/LV " لەگەڵ "ڕژێمی Folfox" ڕێژەی سەرهەڵدانی سکچوون، دابەزینی ڕێژەی خڕۆکە سپییەکانی نۆترۆفیل (نوترپێنی) و نورۆپاتی لەوانەدا کە Folfoxیان پێ دراوە، تا چەند کەرەت زۆرتر بووە لەوانەی کە کەڵکیان لە "ڕژێمی 5FU/LV" وەرگرتووە، بەڵام، ڕادەی زیندوومانەوە بۆ ٦ ساڵ لەو نەخۆشانەدا کە کەڵکیان لە "ڕژێمی Folfox" وەرگرتووە، بەرزتر بووە (٧٣،٣٪ لە بەرامبەر ٦٧٪).

## شوێنگرتنی پاش نەشتەرگەری

**لە قۆناخی یەکەمی شێرپەنجەی کۆڵۆن**دا، کۆکردنەوەی بەسەرهات (ئانامنێز) و تێروانینی لەش و کۆلۆسکۆپی:
* بەدوای ڕێزەکسیۆن لە ڕێگەی ئێندسکۆپییەوە: پاش ٦، ٢٤ و ٦٠ مانگ.

---
601 Hand and foot syndrome

* بەدوای ڕێزەکســــیۆن لە ڕێگەی نەشــــتەگەرییەوە: پاش ٢٤ و ٦٠ مانگ.

**لە قۆناخی یەکەمی شێرپەنجەی ڕەکتۆمدا:**

* پـاش ڕێـزەکســــیۆنـی ڕادیـکـاڵ بە هـۆی نـزمـبـوونـی ڕادەی سـەرهـەڵدانەوەی تومۆر، پێویسـت بە شـوێنگرتنی ڕێکوپێک (پۆر) ناکا. کۆلۆسکۆپی پاش ٢ و ٥ ساڵ دەکرێ.

**کـارســــینۆمی ڕەکتۆم پـاش بڕین و لابردنی خۆجێیی،** ئـانـامنێز و تێڕوانینی لەش:

* پاش ٦، ١٢، ١٨، ٢٤، ٣٦، ٤٨ و ٦٠ مانگ.

* ڕەکتۆسکۆپی، سیگمۆیدسکۆپی، بەپێی دەرفەت ئیندسکۆپی پاش ٦، ١٢ و ١٨ مانگ.

* کۆلۆســــکۆپی پاش ٢٤ و ٦٠ مانگ و پاشــــان کەرەتێک لە هەر ٣ ساڵدا.

**شــــوێنگرتن لە شــــێرپەنجەی کۆلۆڕەکتاڵ لە قۆناخی چواردا** بەپێی سەرهەڵدانی نیشانەکانە.

**لە سیندرۆمی شێرپەنجەی کۆلۆڕەکتاڵی ناپۆلیپۆزی میراتیدا:**

* بەبێ کۆلئەکتۆمی سابتۆتاڵ: کۆلۆسکۆپی هەر ساڵ جارێک.

* پاش کۆلئەکتۆمی سابتۆتاڵ: ڕەکتۆسکۆپی هەر ساڵ جارێک.

**لە پۆلیپۆز ئادنۆماتۆزی بنەماڵەییدا**

* پاش دانـانی کیســــەی ئیلیوم هەر ســــاڵ جـارێک پێویســــت بە پاچۆسکۆپییە[٦٠٢].

* پاش ئیلیۆڕەکتۆستۆمی:

---

602 Pouchoscopy

- ڕەکتۆسکۆپی بە مەودای ٤ هەتا ٦ مانگ.
- گاسترۆدیودینوسکۆپی هەر ٣ ساڵ جارێک پاش ٣٠ساڵی.

### پرۆفیلاکسی بە پێشنیازی WHO

- پێشگیری لە چوونەسەرەوەی قورسایی لەش.
- خواردنی سەوزی وەکو بەشی سەرەکیی خواردەمەنییەکان.
- خواردنی ماسی و گۆشتی باڵندەکان باشترە لە گۆشتی سوور.
- خواردنەوەی ئەلکول کەمتر لە ٢٠ گرام لە ڕۆژدا.
- کەمکێشانی جگەرە.
- زۆرترکردنی چالاکیی لەش.

# سەرچاوەکان

1- Richard S. Eisenstaedt, MD, FACP: Profesor of Medicine &..... MKSAP 16, Colorectal Cancer, p. 79-81. Hematology and Oncology 2015, ACP, USA

2- Amy S. Oxentenko, MD, FACP, Editor, Assistant Professor of Medicine& ... MKSAP 16, Colorectal Neoplasia p. 45-52, Gastroenterology and Hepatology. 2015, ACP, USA

3- Vinay Kumar Kapoor, MBBS, MS: Chief Editor: Thomas R Gest, PhD more... Colon Anatomy, http://emedicine.medscape.com/article/1949039-overview#a2, Updated: Aug 06, 2013

4- Tomislav Dragovich, MD, PhD: Chief Editor: Jules E Harris, MD more... Colon Cancer, http://emedicine.medscape.com/article/277496-overview#showall, Updated: May 15, 2015

5- Gerd Herold und Mitarbeiter, Kolorektal Karzinom, Innere Medizin, Köln 2015

6- Irmtraut Koop Gastroenterologie Compact, Thieme, 3 Auflage, 2013

7- Thomas E. Andreoli/ Ivor J. Benjamin & ....Andreli and Carpenter's CECIL Essentials of Medicine, 8th edition 2010

8- Ronald Bleday, MD، David Shibata, MD&... Overview of surgery for the treatment of primary rectal adenocarcinoma, http://www.uptodate.com/contents/overview-of-surgery-for-the-treatment-of-primary-rectal-adenocarcinoma. Jan 21, 2015.

9- Adachi w , Nishio A, Watanabe H et all (1999) Reresection for local recurrence of rectal tumor , Surg Today 29: 999-1003

10- Adam R,Delvart V,Pascal G,Valenau A,Csataing D,Azoulay D, et all (2004) Rescue surgery for unrespectable colorectal liver metastasis down staged by chemotherapy: a model to predict long-term survival. Ann Surg 240:644-57

11- Beller S, Hünerbein M,Lange T,Eulenstein S,Gebauer B, Schlad PM (2007)image-guided surgery of liver metastases by 3 D ultrasound – based optoelectronic navigation. Br J Surg 94 (7) : 866-875

12- Fong Y, Fortner J, Sun R, Brennen M, Blumgart L, (1999) Clinical score for predicting recurrence after hepatic resection for metastatic colorectal cancer : analysis of 1001 consecutive cases. Ann Surg 230: 309-321

13- Grünberger T, Schuell B, Kornek G, Scheithauer W, (2004)Neoadjuvant Chemotherapy for respectable cancer liver metastases : impact on magnitude of liver resection and survival. I Clinl Obcol 22 : 3598 (Meeting Abstracts)

14- Lorenz M, staib-SeeblerE, Gog C, et al (1999) die Stellung der regionalen Langzeitchemotherapie bei Lebermetastasen Chirurg 70:141-153
15- Nordlinger B , Guiguet M , Vaillant JC , Balladur P , et all (1996) Surgical resection of colorectal carcinoma metastases to the liver.A prognostic scoring system to improve case selection , based on 1568 patients. Association Françoise dE chirurgie. Cancer 77: 1254-1262
16- Penn I ,Hepatic transplantation for primary and metastatic cancers of the liver.Surgery 110: 726-734
17- Poston GJ, Adam R ,Alberts S,Curly S et all (2005) Oncosurge : a strategy for improving respectability with curative intent in metastatic colorectal cancer. J Clin Oncol 23: 7125-7134
18- Robinson BJ, Rice TW, Strong SA, Rybicki LA, Blacjstone EH (1999) Is resection of Pulmonary and hepatic metastases warranted in patients wth colorectal cancer? J Thora r, Cardiovasc Surg 117:66-67
19- Vogt TJ, Muller Pk, Mavk MG et all (1999) Liver metastases : interventional therapeutic techniques and results , state of the art. Eur Radiol 9: 675-684
20- WWW.aco-asso.at"Austrian Society of Surgical Oncology" (ACO-ASSO)
21- WWW.ahpba.org, American Hepato-Pancreato-Billary Association
22- www.cancer.gov, National Cancer Institute
23- www.eortc.be, European Organization for Research and Treatment of Cancer
24- www.ihpba.org, International Hepato-Pancreato-*Billary* Association.

## بەشی هەشتەم

## شێرپەنجەی کۆم[603]

### پەتاناسی

ئەم شێرپەنجەیە بە دەگمەن دەبینرێ. ڕادەی سەرهەڵدانی شێرپەنجەی کاناڵی کۆم ۳ هەتا ٤ جار زۆرترە لە شـــێرپەنجەی پێســـتی دەوری کۆم[604]. مامناوەندیی تەمەن لە کاتی دیاریکردنی شـــێرپەنجەی کۆم لە نێوان ٦٠ هەتــا ٦٥ ســـــاڵە. ڕێژەی شـــێرپەنجەی کۆم لە ڕوانگەی هیستۆلۆژیکەوە بەستراوە بە ناوچەی جوگرافیایی جۆراوجۆرەوە، بۆ وێنە، لە باکووری ئەمەریکا و ڕۆژئاوای ئورووپا شـــێرپەنجەی خانە پوولەکەدارەکان ٨٠٪ی شـــێرپەنجەکان پێک دەهێنێ، بەڵام ئەم ڕادەیە لە ژاپۆنـدا ٢٠٪ و بـاقییەکەی لە چەشـــنی ئـادنۆمـاتۆزە. ڕێژەی سەرهەڵدانی ساڵانەی شێرپەنجەی کۆم لە ژناندا لە نێوان نیو هەتا ١ لە هەر ١٠٠٠٠٠ کەس و ٠,٣ هەتـا ٠,٨ لە هەر ١٠٠٠٠٠ پیـاودایە. شـــێرپەنجەی خانە پوولەکەدارەکان یەک و نیو هەتا ٤ قات لە ژناندا

---

603 Anal Cancer
604 Perianal skin

باوترە. هەروەها ڕادەی سەرهەڵدانی ئەم شێرپەنجەیە لە نێوان نەخۆشەکانی HIV و هۆمۆسێکسواڵدا بە بەراورد لەگەڵ خەڵکی دیکە بەرزترە.

## هۆ و فاکتەرە مەترسیدارەکان

* ڤایرۆسی پاپیلۆمی ئینسانی (HPV)، لە چەشنی ١٦ (٧٠٪) و چەشنی ١٨ (٢٠٪).
* دەواگەلێک کە هۆی دابەزینی سیستەمی بەرگریی لەشن، بۆ وێنە لە نەخۆشەکانی ئێدزدا بەکارهێنانی درێژخایەنی کۆرتۆنەکان لەوە دەچێ هۆی بەرزکردنەوەی مەترسیی سەرهەڵدانی شێرپەنجەی کۆم بێ.
* پێوەندیی جنسی لە ڕێگەی کۆمەوە.
* هەبوونی پێوەندیی جنسیی فرەکەسی.
* فیستولی کۆم.
* ڕەگەز، ژنان بە بەراورد لەگەڵ پیاوان زۆرتر لە مەترسیی سەرهەڵدانی شێرپەنجەی کۆمدان.
* تەمەن. ئەم شێرپەنجەیە زۆرتر لە تەمەنی پاش ٥٠ساڵیدا دەبینرێ.
* جگەرەکێشان.

## پاتۆلۆژی

شێرپەنجەی کۆم تومۆری خانە پوولەکەدارەکان یان ئێپیدەرمۆیدە[٦٠٥] و بە تایبەتی بە هۆی کاریگەریی ڤایرۆسی پاپیلۆمای ئینسانی، زۆرتر لە چەشنی HPV16 و کەمتر HPV 18, 33 و 45 سەرهەڵدەدات[٦٠٦]. لەم نەخۆشییەدا خانە شێرپەنجەییەکان لە نێو تان و پۆی کۆمدا پەرە دەستێنن. کۆم لە کۆتایی ڕیخۆڵەی گەورە و خوارەوەی ڕەکتۆمدایە. دووچەشنە شێرپەنجە لە کۆمدا جیا دەکرێنەوە:

605 Epidermoid

606 Human papillomavirus infection

* شــــێرپەنجەی کانالی کۆم[٦٠٧]: کانالی کۆم کە لە نێوان هێڵی کۆم- ڕێکەڕیخۆڵە[٦٠٨] (لێواری ســەرووی ماســوولکەی بەر ڕێکەڕاســتە[٦٠٩]) و هێڵی پێستیی کۆم[٦١٠]دایە و درێژییەکەی سێ سانتیمەتر و نیوە.
* شــێرپەنجەی لێواری کۆم[٦١١]: شــوێنی ســەرهەڵدانی لە خوارەوەی هێڵی پێستی کۆمدایە و وەکو شێرپەنجەی پێست ئەژمار دەکرێ.

## هیستۆلۆژی

شــێرپەنجەی کۆم لــە ٨٥٪ی بوارەکـانـدا لە چەشــنی خـانە پوولەکەدارەکانە. ئادنۆکارســینۆمی کۆم بە دەگمەن دەبینرێ. ڕێگەی مێتاستاز:



کوی ناریکو پیکی شیرپەنجەی خانە پوولەکەدارەکانی (ئەستیرەکان) کوم

[607]Anal canal
[608] Linea anorectalis
[609]Puborectalis muscle
[610]Linea anocutanea Hilton
[611] Carcinoma of the anal margin oder carcinoma of the perianal area

* لە ڕێگەی لیمفەکانەوە: کارسـینۆمەکانی سـەرەوەی (پرۆکزیمالی) هێڵی داندار (گرنجگرنج)[٦١٢] لە ڕێگەی لیمفەگرێکانی کاسـیلکە و ڕیخۆڵەبەند و کارسـینۆمەکانی ژێرەوەی (دیسـتالی) هێڵی داندار لە ڕێگەی لیمفەگرێکانی ئەشکنجییەوە[٦١٣] تەشەنە دەکەن.

* هێرشـی ڕاسـتەوخۆ بۆ سـفینکتەر، بۆریچەی منداڵدان واتە واژن، میزەڵدان و پرۆستات.

* لە ڕێگەی خوێنەوە: بۆ جگەر، گورچیلەکان و ئێسک.

## پۆلبەندیی TNMی شێرپەنجەی کۆم

### T –تومۆری سەرەتایی

**TX** تومۆری سەرەتایی بۆ هەڵسەنگاندن نابێ.

**T0** تومۆری سەرەتایی دیاری ناکرێ.

**Tis** کارسـینۆم لە جێدا: نەخۆشـیی بۆوین[٦١٤]، تومۆری نێوئیپیتەلیالی خانە پوولەکەدارەکان لە ئاسـتی بەرزەوە و نیوپلازیی ئینترائیپیتەلیالی ئانال III – II (AIN II-III)[٦١٥].

**T1** ئەندازەی تومۆر ٢ سانتیمەتر یان کەمترە.

**T2** ئەنـدازەی تومۆر گەورەترە لە ٢ سـانتیمـەتر و بچووکترە لە ٥ سانتیمەتر.

**T3** ئەندازەی تومۆر گەورەترە لە ٥ سانتیمەتر.

**T4** بڵاوبوونەوەی تومۆر بە ئەنـدازەی جۆراوجۆرەوە لە پێکهـاتە دراوسـێیەکانـدا (وەکو واژن [زێ]، میزەڕێ، میزەڵدان). دزەکردنی ڕاستەوخۆ بۆ نێو دیواری ڕێکەڕاستە، پێستی دەوری ڕێکەڕاستە، تان و پۆی ژێر پێسـت، یان ماسـوولکەی سـفینکتەر وەکو T4 پۆلبەندی ناکرێ.

---

[612] Linea dentata
[613] Inguinal lymph nodes
[614] Bowen's disease
[615] Anal intraepithelial neoplasia

**N– لیمفەگرێ ناوچەییەکان**

**NX** لیمفەگرێ ناوچەییەکان بۆ هەڵسەنگاندن نابن.

**No** نیشانەیەک لە مێتاستازی لیمفەگرێ ناوچەییەکان نابینرێ.

**N1** سەرهەڵدانی مێتاستاز لە لیمفەگرێکانی دەوری ڕێکەڕاستە.

**N2** سەرهەڵدانی مێتاستاز لە لیمفەگرێکانی یەکلای کلۆتەی ژوورەکی و/ یان ئەشکنجی[٦١٦].

**N3** مێتاستاز بە لیمفەگرێکانی دەوری ڕێکەڕاستە و ئەشکنجی و/ یان لیمفەگرێکانی هەردوو لای کلۆتەی ژوورەکی و/ یان ئەشکنجی.

**M –مێتاستازی دوور**

**M0** مێتاستازی دوور نابینرێ.

**M1** سەرهەڵدانی مێتاستازی دوور.

[616]Unilateral internal iliac and/or inguinal lymph node(s)

## قۆناخەکانی کارسینۆمی کۆم

| | |
|---|---|
| 0 | Tis/N0/M0 |
| قۆناخی I | T1/N0/M0 |
| قۆناخیII | T2/N0/M0<br>T3/N0/M0 |
| قۆناخی IIIA | T1/N1/M0<br>T2/N1/M0<br>T3/N1/M0<br>T4/N0/Mo |
| قۆناخی IIIB | T4/N1/M0<br>هەر کام لە T-یەکان /N2/M0<br>هەر کام لە T-یەکان /N3/M0 |
| قۆناخی IV | M1/هەر کام لە N-ەکان/ هەر کام لەT-یەکان |

## نیشانەکان

خوێنبەربوونی کۆم، ئێش، گوشـــــار و خورووو (ئـاڵۆش) لە کۆمـدا، هەروەها هەسـتکردن بە بوونی تۆپەڵێکی نائاسـایی لە نزیکی کۆمدا لە نیشـــانە باوەکانی شـــێرپەنجەی کۆمن. لە هەرچەشـــنە ئاڵوگۆڕێکی نائاسایی کۆمدا پێویست بە لێکۆڵینەوە لە ڕێگەی بیوپسییەوە هەیە.

## دیاریکردن

بۆ دیاریکردن هەنگاوەکانی خوارەوە پێویستن:

* تێڕوانینی لەش و کۆکردنەوەی بەسەرهات.
* تێڕوانینی کۆم بە قامک[٦١٧].
* سۆنۆگرافیی جگەر و ڕادیۆگرافیی سییەکان.
* ڕەکتۆسکۆپی.
* ئیندۆسۆنۆگرافی.
* بیوپسی و هیستۆلۆژی.
* کامپیوتێرتومۆگرافیی کاسیلکە، سک و سییەکان.
* دیاریکردنی نیشانەکەرەکانی تومۆر وەکو SCC و CEA.

## چارەسەر

لە سەرەتادا ئەم بیرۆکەیە باو بوو کە نەشتەرگەری هەڵبژاردەی هەوەڵە بۆ دەرمانی شێرپەنجەی کۆم، بەڵام ئێستا شێرپەنجەی کۆم، بە پێچەوانەی شێرپەنجەی ڕەکتۆم، لە سەرەتادا بە **کۆی ڕادیاسیۆن و شیمۆدەرمانی** چارەسەر دەکرێ و نەشتەرگەری ئیندیکاسیۆنی نییە. لە تومۆرەکانی لێواری کۆمدا پەرەسەندنی خۆجێیی یان جیانەکراوەی کاناڵی کۆم G3 تیشکدەرمانیی لیمفەگرێکانی ئەشکنجی پێویستە. لە قۆناخە سەرەتاییەکاندا T1/N0 لەوە دەچێ تەنها ڕێزەکسیۆنی تومۆر و تیشکلێدانی خۆجێیی بە دۆزی 56-66 Gy (تومۆر لە قۆناخی T1-T2) پێویست بێ. لە کاتی پەرەسەندنی خۆجێیی تومۆر T2-T4, N0-2 سەرەڕای ئەم تراپییە، **ڕێزەکسیۆنی تومۆر** لە ڕێگەی نەشتەرگەرییەوە پێویستە، بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم چەشنە نەشتەرگەرییە هەمیشە لە پێوەندی لەگەڵ ڕێزەکسیۆنی

---

617 Digital rectal examination (DRE)

ئابدۆمینال – پرینیال[618] و کۆلۆســـتۆمی هەمیشـــەییدایە[619]. پاش ڕیزەکسیۆنی R0، کاتێک تومۆر لە چەشنی T1 یان T2دا بێ، دەکرێ کەڵک لە تیشـــکدەرمـانیی یـاریـدەدەر بە دۆزی ٥٦ هەتـا ٦٠ گرێ وەربگیرێ. میتۆمیسین[620] و 5-FU ڕژیمی ستانداردی **شیمۆدەرمانییە** و لە پێوەنـدی لەگەڵ **ڕادیـاســـیۆنتراپی**دا بەکـار دەهێنرێ. لەو لێکۆڵینەوانەی کە ســـیزپلاتینیان لەگەڵ میتۆمیســـین بەراورد کردووە، حـاڵەتی ژەهراویبوونی ســـــیزپلاتین لە میتۆمیســـــین زۆرتر بووە و کاریگەرییشـــی بۆ دەرمانی شـــێرپەنجەی کۆم لە میتۆمیســـن باشـــتر نەبووە. لە پێوەندی لەگەڵ ڕادیۆ یان ڕادیۆشـــیمۆتراپیدا، بە دەگمەن



**کارسینۆمی پەرەگرتووی کۆم**

618 Abdominal -perineal resection
619 Permanent colostomy
620 Mitomycin

وێچوونی سەرهەڵدانی ئاڵۆزی، وەکو زامی ئێشدار، ستنۆز (تەسکی) یان فیستولی ڕەکتۆواژینالٚ[٦٢١] هەیە. لەوە دەچێ ڕادیاسیۆنی خۆجێیی بە دۆزی سەرەوە هۆی تێکچوونی ڕەوتی سارێژبوونەوەی برین بێ.

**شوێنگرتن** لە ساڵی یەکەمدا هەر ٣ مانگ، لە ساڵی دووەمدا هەر ٦ مانگ و پاشان هەر ١٢ مانگ جارێک: ڕەکتوسکۆپی لەگەڵ ئێندۆسۆنۆگرافی، سۆنۆگرافیی جگەر، وێنەگرتنی سییەکان بە یارمەتیی تیشکی ئێکس؛ وێناکردنی زرنگاوەی موگناتیسی یان تومۆگرافیی کاسیلکە لە مەودای ٦ مانگدا (لە دوو ساڵی هەوەڵدا).

## دوابینی

لە نەبوونی مێتاستازی لیمفەگرێکانی ئەشکنجیدا ڕێژەی زیندوومانەوە بۆ ماوەی ٥ ساڵ نزیکەی ٨٠٪یە.

621Rectovaginal fistula

# سەرچاوەکان


1- Author: Jeffrey B VanDeusen, MD, PhD؛ Chief Editor: Jules E Harris, MD more... Anal Cancer Staging, http://emedicine.medscape.com/article/2003634-overview.

2- Richard S. Eisenstaedt, MD, FACP؛ Profesor of Medicine &..... MKSAP Anal Cancer, p. 81. Hematology and Oncology 2015, ACP, USA.

3- Gerd Herold und Mitarbeiter, Analkanalkarzinom, Innere Medizin, Köln 2015.

4- John L. Zeller, MD, PhD, Writer؛ Cassio Lynm, MA, Illustrator؛ Richard M. Glass, MD, Editor, Anal cancer. AMA. 2008؛299(16):1980. Doi:10.1001/jama.299.16.1980.

5- Bernard J. Cummings, Carol J. Swallow, and Jaffer A. Ajani, Cancer of the Anal Region, p. 1301-1312, Cancer, Principles& Practice of Oncology, Volume One, Lippincott, 2008.

## بەشی نۆیەم

## شێرپەنجەی تیرۆید٦٢٢
## پەتاناسی

لە دەیەکانی ڕابوردوودا ڕێژەی سەرهەڵدانی شێرپەنجەی تیرۆید بە چەشنێکی بەردەوام و بەرچاو لە تەواوی جیهاندا بەرز بووەتەوە. کارسینۆمی تیرۆید پاش کارسینۆمی هێلکەدانی ژن باوترین تومۆری سیستەمی ئیندۆکرینە. شێرپەنجەی تیرۆید هەر ساڵ لە ئەمەریکا ١٪ هەتا ١،٥٪ی تەواوی شێرپەنجە تازەدیاریکراوەکان لە خۆ دەگرێ. ئەم ڕێژەیە لە سێ دەیەی ڕابوردوودا بێجگە لە ئەفریقا (لەوە دەچێ بە هۆی ناتەواوی یان کەمایەسی لە ڕەوتی دیاریکردندا بێ) لە گشت جیهاندا بەردەوام زیادی کردووە. بەپێی زانیارییەکانی ئەم دواییانە، شێرپەنجەی تیرۆید پێنجەمین شێرپەنجەی باوە لە ژناندا. ئەم ڕادەیە لە نێو ژنانی ئیتالیایی لە تەمەنی ژێر ٤٥ ساڵدا لە پلەی دووەمین شێرپەنجەی باودایە. تەنها لە چەند وڵاتێک وەکو نورویژ و سوید ڕێژەی سەرهەڵدانی ئەم شێرپەنجەیە دابەزیوە. ئەم جیاوازییە لە

[622] Thyroid cancer

سـەرهەڵدانی شـێرپەنجەی تیرۆید ڕەنگە لە پێوەندی لەگەڵ فاکتەری ژنێتیکی، کاریگەریی ژینگە و ئاستی خزمەتگوزاریی پزیشکیدا بێ لەم وڵاتانەدا. ویچوونی ئەم کارسـینۆمە لە هەر تەمەنێکدا هەیە، بەڵام ڕادەی سـەرهەڵدانی لە ژناندا بە بەراورد لەگەڵ پیاواندا ٢ هەتا ٣ قات بەرزترە. لوتکەی سـەرهەڵدانی ئەم نەخۆشـییە لە دەیەکانی سـێ و چواری ژیاندایە.

**هۆیەکان:**

* **فاکتەری ژنێتیکی**[٦٢٣].

* **کاریگەریی تیشـک**[٦٢٤]. تیشـک بە چەشـنێکی بەرچاو ڕادەی سـەرهەڵدانی شـێرپەنجەی تیرۆید بەرز دەکاتەوە. ئەم حاڵەتە بە تایبەتی لەو منداڵانەدا کە پاش بۆمبارانی ئەتۆمیی هیرۆشـیما و ناکازاکی لە کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانیدا لە ژاپۆن یان پاش کارەسـاتی ئەتۆمیی چێرنۆبیل لە ٢٦ی ئەپرلی ١٩٨٦دا لە ڕووسـیای سپی لەدایک بوون، بە باشی دەبینرێ.

* **فاکتەری نادیار.**

623 Genetic factors
624 Radiation

## قەوارە و کاری تیرۆید

تیرۆید بە ڕەنگی قاوەیی – سـوورباو و لە شـکڵی پەپوولەدایە. تیرۆید لە بەشـی خوارووی پێشـەوەی مل و بەرامبەر بە درێژایی بڕگەی پێنجی مل (C5) هەتا یەکی سـینگ (T1) و لە ژێر سـێوی ئادەمدا[٦٢٥] جێگیر بووە. تـیرۆیـد لە دوو پەڕە (لـۆب)[٦٢٦] پـێـک هـاتـووە کە بە هـۆی پـردێـک (ئیسـتموس[٦٢٧]) بەیەکەوە لکاون. درێژیی هەر لۆبێک ٥٠-٦٠ میلیمـەتر و قورسـایی تیرۆید لە گەورەسـالاندا لە نێوان ٢٥ تا ٣٠ گرامدایە. لە ژناندا و بە تایبەتی لە کاتی نەشـوری و سـکپڕیدا کێشـی تیرۆید بە بەراورد لەگەڵ پیاوان زیاترە. تیرۆید لە ڕوانگەی میکرۆسـکۆپییەوە لە چەندین فۆلیکول[٦٢٨] پێـک هـاتووە. ئەم فۆلیکولانە مـادەی کلۆیـدیـان[٦٢٩] هەیە. خـانەکـانی فۆلیکولی[٦٣٠] بەرهەمهێنەری تیرۆگلۆبینن[٦٣١] کە پـاش دروسـتبوونیـان لە چەشـنی کلۆید کۆ دەبنەوە. بیۆسـینتێزی[٦٣٢] T4 و T3 ئاکامی یۆداربوونی مۆلیکۆلەکانی تیرۆزین[٦٣٣]ن لە تیرۆگلوبیندا. تیرۆید لە ڕێگەی بەرهەمهێنانی هۆرمۆنەکـانی تیرۆکسـین[٦٣٤] و تری یۆد تیرۆنین[٦٣٥] ڕۆڵێکی گرینـگ لە سـەلامەتیی مرۆڤ، ڕێکخسـتنی مێتابۆلیسـمی لەش، ڕەوتی گەشـەکردنی مرۆڤ و هتد...دا دەگێڕێ. لیمفەگرێ نـاوچەییەکـان بریتین لە لیمفەگرێکانی مل و سـەرەوەی نێوان دوو سـییەکان. پاراتیرۆید[٦٣٦] دەکەوێتە بەشـی پشتەوەی سەرەوە و خوارەوەی تیرۆید.

---

625 Adam's apple
626 Lobes
627 Isthmus
628 Follicle
629 Colloid
630 Follicular cells
631 Thyroglobulin
632 Biosynthesis
633 Tyrosine
634 Thyroxine ($T_4$)
635 Triiodothyronine ($T_3$)
636 Parathyroid glands




## پاتۆلۆژی

**چەشنەکانی کارسینۆمی تیرۆید** بریتین لە:

**١. کارسینۆمی جیاکراوە[637]:**

* کارسینۆمی پاپیلاری[٦٣٨] (٨٠٪).

* کارسینۆمی فۆلیکولار[٦٣٩] (١٠٪).

**٢. کارسینۆمی جیانەکراوە[٦٤٠]**

* کارسینۆمی ئاناپلاستیک[٦٤١] (١٪ هەتا ٢٪)

**٣. کارسینۆمی مێدولاری تیرۆید[٦٤٢]:** (٥٪ هەتا ١٠٪)ی کارسینۆمەکانی پاپیلاری، فۆلیکولار و ئاناپلاستیک لە خانەکانی فۆلیکولارییەوە سەرچاوە دەگرن. کارسینۆمەکانی پاپیلاری و فۆلیکولار، هەروەها

---

637 Differentiated carcinoma
٦٣٨ Papillary carcinomas
639 Follicular carcinomas
640 Undifferentiated carcinoma
641 Anaplastic carcinomas
642 Medullary thyroid carcinomas

ئوکســـیفیلەکان[٦٤٣] (خانەکانی هورتێل[٦٤٤]) وەکو چەشـــنی جیاکراوە[٦٤٥] پێناسە دەکرێن.
شێرپەنجەی مێدولاری تیرۆید کە وەکو دووەمین چەشنی شێرپەنجەی تیرۆید پێناســـــە دەکرێ و لە خانەکانی پارافۆلیکۆلار (خانەکانی– c) سەرچاوە[٦٤٦] دەگرێ و ٧٥٪ی لە چەشـنی سـپۆرادیکو[٦٤٧] و ٢٥٪ی لە چەشنی زگماکییە.



چەشنی پاپیلاریی شێرپەنجەی تیرۆید

643 Oxyphil cell (parathyroid)
644 Hürthle cell
645 Differentiated
646 Parafollicular (C—cells)
647 Sporadic

## شێرپەنجەی تەنیشتەتیرۆید[648]

ڕادەی ســــەرهەڵدانی ئەم شــــێرپەنجەیە کەمە و بە دەگمەن دەبینرێ. ئەم شــێرپەنجەیە تەنها ٣٪ی هەموو نەخۆشــییەکانی هیپۆپاراتیرۆیدیســم[649] لە خۆ دەگرێ و زۆرتر لە دەیەکانی پێنجەم و شــەشــەمی ژیاندا ســەرهەڵدەدا، لە منــداڵانــدا زۆر بە دەگمەن دەبینرێ. ڕادەی کــالســــیۆمی خوێن لەم نەخۆشــییەدا بە چەشــنێکی بەرچاو بەرز دەبێتەوە، تەنانەت لەوانەیە ببێتە هۆی ســەرهەڵدانی قەیرانی هیپێرکالسـیمیک[650]. ڕادەی هۆرمۆنی پاراتیرۆید لەم حاڵەتەدا دوو تا سێ قات بەرزترە لە حاڵەتی ئاسـایی. تایبەتمەندییەکانی ئەم نەخۆشــییە بریتین لە: گۆڕانی پێکهاتەی ئێســک، دروســتبوونی بەردی گورچیلە، ســــەرهەڵــدانی خەمۆکی، هەروەهــا هەبوونی تومۆرێــک کە بە دەســت هەســتی پێ بکرێ. بڕین و دەرهێنانی تومۆری تەنیشــتەتیرۆید لە ڕێگەی نەشتەرگەرییەوە کارێکی هاسان نییە.

## پۆلبەنـدیی تی ئێن ئێم (TNM)[651] کـارســــینۆمی تیرۆیـد (بەپێی UICC/AJCC 2009)

### T تومۆری سەرەتایی[652]

**To** نیشانەی تومۆری سەرەکی نابینرێ.

**T1a** تومۆر بەرامبەر یـان بچووکترە لە ســــانتیمـەترێـک و پـانتـایی بڵاوبوونەوەی لە چوارچێوەی تیرۆیددایە.

**T1b** تومۆر گەورەترە لە ســــانتیمــەترێــک و بچووکترە لە دوو سانتیمەتر، هەروەها پانتایی بڵاوبوونەوەی لە چوارچێوەی تیرۆیددایە.

---

648 Parathyroid carcinoma

649 Hypoparathyroidism

650 Hypercalcemic crisis

651 TNM Classification (T: تومۆر N: تەشەنەکردن بە لیمفەگرێکاندا M: تەشەنەکردن)

652 Primary tumor

**T2** تومۆر گەورەترە لە دوو سانتیمەتر و بچووکترە لە چوار سانتیمەتر، هەروەها پانتایی بڵاوبوونەوەی لە چوارچێوەی تیرۆیددایە.
**T3** تومۆر گەورەترە لە چوار سانتیمەتر و پانتایی بڵاوبوونەوەی لە چوارچیوەی تیرۆیددایە یان بە ڕادەیەکی زۆر کەم لە نێو پێکهاتە دراوسێیەکاندا تەشەنەی کردووە.
**T4a** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە کەپسوولی تیرۆیدی ئەو لایەی کە تووشی شێرپەنجە بووە یان لە پێکهاتە دراوسێیەکاندا (بێجگە لە ڕەگەکان).
**T4b** بڵاوبوونەوەی تومۆر لە فاسیای (پێچەری، پۆشەری) پێشەوەی بڕبڕەی مل[٦٥٣]، ڕەگەکانی میدیاستینوم یاخود خوێنبەری کارۆتید (خەوەخوێنبەر)[٦٥٤].

## N لیمفەگرێ ناوچەییەکان

**Nx** لیمفەگرێ ناوچەییەکان دیاری ناکرێن.
**No** نیشانەیەک لە مێتاستازی لیمفەگرێ ناوچەییەکان نابینرێ.
**N1** مێتاستاز بە لیمفەگرێ ناوچەییەکان دەبینرێ.
**N1a** مێتاستاز بە لیمفەگرێکانی پێشەوە یان تەنیشتی بۆریی هەناسە[٦٥٥] دەبینرێ.
**N1b** مێتاستاز بە لیمفەگرێکانی دیکە دەبینرێ (یەک لەوان میدیاستینوم).

## M مێتاستازی دوور

**M0** مێتاستازی دوور نابینرێ.
**M1** سەرهەڵدانی مێتاستازی دوور.

---
653 Prevertebral fascia
654 Carotid artery
655 Trachea

## قۆناخەکانی کارسینۆمی پاپیلاری یاخود فۆلیکولاریی تیرۆید

| قۆناخ | تەمەنی ژێر ٤٥ ساڵ | تەمەنی سەرەوەی ٤٥ ساڵ |
|---|---|---|
| قۆناخی I | TX-T4, NX-N1b, M0 | T1, N0, M0 |
| قۆناخی II | TX-T4, NX-N1b, M1 | T2-T3, N0, M0 |
| قۆناخی III | | T4, N0, M0,<br>TX-T4, N1, M0 |
| قۆناخی IV | | TX-T4, NX-Nb, M1 |

## کارسینۆمی مێدولاری تیرۆید

| | | | |
|---|---|---|---|
| قۆناخی I | M0 | N0 | T1 |
| قۆناخی II | Mo | N0 | T2-T4 |
| قۆناخی III | M0 | NX-N1b | TX-T4 |
| قۆناخیIV | M1 | NX-N1b | TX-T4 |

**کارسینۆمی ئاناپلاستیکی تیرۆید (تەواوی بوارەکان لە پلەی چواردان)**

| | پلەی جیاکراوەی هیستۆپاتۆلۆژیک[656] |
|---|---|
| GX | وێچوونی قۆناخبەندی نییە |
| G1 | بە باشی جیا کراوەتەوە |
| G2 | تا ڕادەیەک جیا کراوەتەوە |
| G3 | باش جیا ناکرێتەوە |
| G4 | جیا ناکرێتەوە |



شێرپەنجەی پەرەگرتووی تیرۆئید

656 Histopathologic

## نیشانەکان

گرێکان لە کارسینۆمی تیرۆیددا بیئێشن و لە تێڕوانینی لەشدا دەبینرێن.[٦٥٧] زۆر جار نەخۆش یان پزیشک ئەم گرێیانە لە کاتی تێڕوانینی ملدا دەدۆزنەوە. ئەم گرێیانە بۆ هەوەڵین جار لە ٢٥٪ی نەخۆشەکاندا لە کاتی سۆنۆگرافیدا دەبینرێن. گرێکانی شێرپەنجەی تیرۆید لە زۆربەی بوارەکاندا بیئێشن، بەڵام سەرهەڵدانی لەناکاوی ئێش لەوە دەچێ زۆرتر لە پێوەندی لەگەڵ نەخۆشیی ناشێرپەنجەیی تیرۆیددا بێ. گڕبوونی دەنگ زۆرتر بە هۆی گیرۆدەبوونی گەڕاوەدەماری قوڕگ[٦٥٨] و فەلەجبوونی تاری دەنگییە[٦٥٩]. لەوە دەچێ دیسفاژی (قووتنەچوونی خواردەمەنی)[٦٦٠] نیشانەی تەشەنەکردنی شێرپەنجە بێ بۆ دەزگای هەرسکردن. هەروەها لە کاتی پەرەسەندنی ئەم نەخۆشییەدا لەوانەیە سیندرۆمی هۆرنێر[٦٦١]، گەرووئێشە، هەروەها ئێشی گوێ و پشتی سەر ببینرێ..

## دیاریکردن

کۆکردنەوەی بەسەرهاتی پزیشکی (ئانامنێز)[٦٦٢] و تێڕوانینی جەستە لە هەوەڵین هەنگاوەکانی دیاریکردنی شێرپەنجەی تیرۆیدن. بۆ دیاریکردنی فونکسیۆنی تیرۆید تەنانەت ئاگاداری لە ڕادەی هۆرمۆنی وروژێنەری تیرۆید (TSH)[٦٦٣] بەسە. کاتی بەرزبوونەوەی ڕادەی TSH پێویستە ڕادەی (FT4)[٦٦٤] و (FT3)[٦٦٥] ڕوون بکرێتەوە.
لەوە دەچێ زێدەبوونی ڕادەی کالسیتونینی[٦٦٦] خوێن هەوەڵین نیشانەی شێرپەنجەی تەنیشتەتیرۆید لە چەشنی سپۆرادیک بێ،

---

657 Palpable
658 Recurrent laryngeal nerve
659 Vocal fold paralysis
660 Dysphagia
661 Horner's syndrom
662 Anamnesis
663 Thyroid-stimulating hormone
664 Hormone thyroxine ($T_4$)
665 Triiodothyronine ($T_3$)
666 Calcitonin

ئەویش لە کاتێکدا هیچ نیشـــانەیەکی کلینیکی ســـەری هەڵنەداوە. بۆ دیـاریکردنی چەشـــنی زگمـاکیی شـــێرپەنجەی مێدولاری تیرۆیـد، تاقیکردنەوەی موتاسـیۆنی کرۆمۆزمی X[٦٦٧] لە خوێندا پێویسـتە. پێش نەشـــتەرگەری پێویســـتە ڕوون بکرێتەوە کە نەخۆش تووشـــی ڤیۆکروموسـیتۆم[٦٦٨] و هیپێرپاراتیرۆیدیسمی سەرەکی[٦٦٩] بووە یان نا؟ **ســـۆنۆگرافی** هەلێکی باش دەڕەخســـێنێ بۆ بەراوردکردنی ئەندازە، ڕێژە، هەروەهـــا مۆرفۆلۆژی[٦٧٠]ی تـیرۆیـــد و دیـــاریکردنی گرێ، هەروەهـا لیمفەگرێکانی دراوســـێی. زۆربەی ئەو گرێیـانەی لە کـاتی ســـۆنوگرافیدا هیپۆئێکۆیکن[٦٧٢] (نزمەزایەڵەن، یان بە دەنگدانەوەیەکی کەمەوەن)، لە چەشـــنی تومۆری بێئازارن[٦٧٣]. هەروەها بۆ دیاریکردن، دەکرێ کەڵـک لە **ســـینتیگرافی**[٦٧٤] وەربگیرێ. گرێی ســـــارد[٦٧٥] لە ســـینتیگرافیدا لەوە دەچێ زۆرتر نیشـــانەی شـــێرپەنجەی تیرۆید بێ. ١٦٪ی ئەو گرێ ســـــاردانە کە لە ڕێگـەی نەشـــتەرگەرییەوە جیـا کراونەتەوە، لە چەشـنی مەترسـیدار بوون، هەر لەبەر ئەوە، پێویسـتە پـاش دیـاریکردنیـان، ئەم گرێیـانە لە ڕێگەی نەشـــتەرگەرییەوە جیـا بکرێنەوە. پێش نەشـــتەرگەری، **پونکســـیۆن ســـتیۆلۆژی**[٦٧٦]ی تیرۆید یاریدەی دیاریکردنی ئەم نەخۆشـییە دەدا، بەڵام دەسـتنیشـانکردنێکی ورد لە پێوەنـدی لەگەڵ شـــێوەی کـار و شـــــارەزایی پســـپۆڕی ســـیتوپاتۆلۆژی[٦٧٧] لەســـەر پونکتاتە[٦٧٨] [مەبەسـت نموونەی تان و پۆ یان شلەئاوێکە کە لە ڕێگەی پونکسیۆنەوە لە ئەندام جیا دەکرێنەوە].

---

667 X chromosome
668 Pheochromocytoma
669 Primary hyperparathyroidism
670 Morphology
671 Cyst
672 Hypoechoic
673 Benign
674 Scintigraphy
675 Cold Nodule
676 Aspiration cytology
677 Cytopathology
678 Punctate

## چارەسەر

### نەشتەرگەریی شێرپەنجەی تیرۆید لە چەشنی جیاکراوە

بۆ هەڵبژاردنی ستراتیژیی شیاو لە نەشتەرگەریدا، پێویستە ئەم خاڵانە لەبەرچاو بگیرێن:

* نەشتەرگەری سەرەکیترین ڕێگەی دەرمانیی شێرپەنجەی تیرۆیدە.

* ٥٠٪ی شێرپەنجەی تیرۆید پاش نەشتەرگەری بە هۆی نەخۆشیی ناشێرپەنجەییەوە دیاری دەکرێ.

* لە کاتی دووپاتکردنەوەی نەشتەرگەریدا وێچوونی زەبروێکەوتنی گەڕاوەدەماری قوڕگ، هەروەها سەرهەڵدانی هیپۆپاراتیرۆیدیسم و ئاڵۆزییەکانی دیکە بەرز دەبێتەوە.

کاتێک لە سیتۆلۆژی[٦٧٩] و پونکتاتدا وێچوونی شێرپەنجەی تیرۆید یاخود نیۆپلازیی[٦٨٠] فۆلیکولار هەبێ، پێویست بە هێمیتیرۆیدئەکتۆمی[٦٨١] و بڕین و لابردنی لیمفەگرێکانی هەر ئەو لایەی هەیە کە نەشتەرگەری کراوە. لە کاتی نەشتەرگەریدا پاش بڕین و جیاکردنەوەی بەشێک لە تیرۆید، ئەو بەشە لە حاڵەتی ڕچاودا (بەستوو)[٦٨٢] بۆ ئاگاداریی وردتر، بە زووترین کات بۆ پسپۆڕی پاتۆلۆژی دەنێررێ، کاتێک پسپۆڕی پاتۆلۆژی باوەڕی بە شێرپەنجەبوون هەبێ، پێویستە تەواوی تیرۆید و لیمفەگرێ ناوەندییەکان لە ڕێگەی نەشتەرگەرییەوە جیا بکرێنەوە، بەڵام کاتێک پسپۆڕی پاتۆلۆژی گومانی لە مەترسیداربوونی تومۆر هەبێ، بڕیار بۆ تیرۆیدئەکتۆمی پاش هاتنەوەی وەڵامی گونجاوی سیتۆپاتۆلۆژیک دەدرێ و پێویستە تەواوی تیرۆید و لیمفەگرێ ناوەندییەکان پاش ٢ هەتا ٣ مانگ لە ڕێگەی نەشتەرگەرییەوە جیا بکرێنەوە.

---

679 Cytology
680 Neoplasia
681 Hemithyroidectomy
682 Frozen

لە وڵاتانی ئینگلیســـــی – ئەمـەریکاییدا لە جێگەی دەرهێنانی تەواوی تیرۆیـد، کەڵـک لە شـــێوەی بڕین و جیـاکردنەوەی Near-Total-Resection وەردەگیرێ. پـاش دەرهێنـانی تەواوی تیرۆیـد، بۆ لەنێوبردنی پاشـماوەی خانە شـێرپەنجەییەکان، هەروەها مێتاسـتازی دوور، دەکرێ کەڵک لە ڕادیۆیۆدتراپی[٦٨٣] وەربگیرێ.

## تراپیی شێرپەنجەی ئاناپلاستیکی تیرۆید لە ڕێگەی نەشتەرگەرییەوە

ڕادەی ســەرهەڵدانی شـێرپەنجەی ئاناپلاسـتیکی تیرۆید لە ئورووپا بە هۆی خـواردنی یـۆد ڕۆژبەڕۆژ کەمـتر دەبێتەوە. نەشـــــتەرگەری شیاوترین چەشنی تراپییە بۆ پێشگیری لە تەنگبوونی ڕێگەی هەناسە، بەڵام زۆر جار بە هۆی پەرەســـەندنی خێرای شـــێرپەنجەوە دەرفەتی پێویست بۆ نەشتەرگەری ڕێک ناکەوێت.

## تراپیی شێرپەنجەی مێدولاری تیرۆید لە ڕێگەی نەشتەرگەرییەوە

لە تـایبەتمەنـدییەکـانی شـــێرپەنجەی مێـدولاری تیرۆیـد، پەرەســـەنـدنی ئەم شێرپەنجەیە لە ناوەندی تیرۆیدەوە بەرەو ئەندامە دراوسێیەکان و تەشەنەکردنی پێشـــوەختی بۆ لیمفەگرێکانە. لە شـــێرپەنجەی ســـپۆرادیک و زگماکیدا بڕین و جیاکردنەوەی تەواوی تیرۆید و لیمفەگرێ ناوەندییەکان پێویستە.

لە کاتی تەشـەنەکردنی شێرپەنجە بە میدیاستینۆمی سەروو و خواروو و پەیتاپەیتا چوونەسـەرەوەی کالسـیتۆنینی خوێندا، سـتێرنۆتۆمی[٦٨٤] و لابردنی تەواوی لیمفەگرێکـانی ئەم نـاوچەیە پێویســـتـە. کـاتێـک لە تـاقیکردنەوەی ژێنێتیکیدا گومان لە شـــێرپەنجەی زگماکیی مێدولاری تیرۆیـد هـەبێ، پێویســـتە بۆ پرۆفیلاکســـی،[٦٨٥] تیرۆیـد لە ڕێگـەی

---

683 Radioiodine therapy
684 Sternotomy
685 Prophylaxy

نەشــتەرگەرییەوە جیا بکرێتەوە، بەڵام بە هۆی مەترسـیی فەلەجبوونی گەڕاوەدەماری قوڕگ و هیپۆپاراتیرۆیدیســم لە کاتی نەشــتەرگەریدا و بەتــایبەتی لە منــداڵانــدا، پێویســـــتە ئەم نەشـــــتەرگەرییە لە لایەن نەشتەرگەرێکی زۆر بەئەزموونەوە ئەنجام بدرێ.

## تراپیی شێرپەنجەی تەنیشتەتیرۆید لە ڕێگەی نەشتەرگەرییەوە

نیشـــــانەکـانی کلینیکی، تـاقیکردنەوەکـانی لابراتۆری، هەروەهــا سـۆنۆگرافی، تێکنیسیۆم[٦٨٦] و سینتیگرافی یاریدەی ڕەوتی دیاریکردنی تومۆر دەدەن، بەڵام لەم ڕێگـەیەوە نـاکرێ مەترســـیداربوون یـان بێئـازاربوونی تومۆرەکە دیـاری بکرێ. زۆربەی نەخۆشــــەکـان لە ســـەرەتـادا بە هۆی نەخۆشـــییەکی نـاشــێرپەنجەیی تیرۆیـدەوە نەشــــتەرگەری دەکرێن، بۆیە پێویســـتە لە کـاتی نەشــــتەرگەریـدا نیشــانەکانی ماکرۆســـکۆپی شـــێرپەنجە دیاری بکرێن. لە حاڵەتی گومــانکردن لە هەبوونی شــــێرپەنجەدا، هێمیتیرۆیـدئەکتۆمی (En-Block) و بڕین و جیاکردنەوەی هاوکاتی لیمفەگرێکانی ئەو لایەی کە نەشتەرگەری کراوە و هەروەها تێڕوانینی تەنیشتەتیرۆیدیش پێویستە.

## پێشگیری لە سەرهەڵدانی فەلەجبوونی گەڕاوەدەماری قوڕگ

ڕادەی فەلەجبوونی گەڕاوەدەماری قوڕگ، سـەرەڕای دەستنیشـانکردنی ئەم دەمـارە لە کـاتی نەشـــتەرگەری و کەڵکوەرگرتن لە نۆیرۆمۆنیتۆرینـگ[٦٨٧] (دەزگای چاودێریی دەمار)دا نەگەیشـــتووەتە ژێرەوەی ١٪. تا ئیســـتا هیچ لێکۆڵینەوەیەکی زانســـتی نیشـــانی نەداوە کە کەڵکوەرگرتن لە دەزگـای چـاودێریی دەمـار بـاشـــترە لە ڕەوتی دیـاریکردنی دەمـارەکە لە لایەن نەشــــتەرگەرەوە. بۆ پـارێزکردن لە زەبروێکەوتنی دەمار بە هۆی گەرماوە،

---

[٦٨٦] Technetium
[٦٨٧] Neuro - monitoring

پێویسـتە لە کاتی نەشـتەرگەریدا کەڵک لە ئەلیکترۆکواگولاسـیۆن[688] بە مـەقـاشـی دووجەمسـەرە[689] وەربگیرێ. بەکـارهێنـانی چـاویلکەی هوورەکبین[690] لە کـاتی نەشـتەرگەریـدا دەبێتە هۆی دابەزینی ڕادەی زەبروێکەوتنی گەڕاوەدەماری قورگ.

## چەشنەکانی دیکەی تراپی

بۆ دەرمانی شـێرپەنجەی تیرۆید، بێجگە لە تیرۆیدئەکتۆمی، هەروەها کەڵک لە ڕادیۆتراپی، هۆرمۆنتراپی[691] بۆ تەواوی ژیان و بەتایبەتی لە سوپرسیۆنتراپی[692]، تیشکدەرمانی و شیمۆتراپی وەردەگیرێ.

## شوێنگرتنی پاش نەشتەرگەری

### شیمۆدەرمانی

لە شـێرپەنجەی تیرۆیددا بە ڕادەی سـەرەوەی جیاکراوە، هەروەها بۆ ئەو مێتاسـتازانەی کە بە یۆد هەسـتیار نین، دەکرێ کەڵک لە کۆی ئانتراسـیکلین[693] و بیلۆمیسـین[694] وەربگیرێ. لە کاتی پەرەسـەندن و تەشـەنەکردنی شـێرپەنجەی مێدولاری تیرۆیددا ئەم شـیمۆدەرمانییە پێشنیاز دەکرێ:

* Cisplastin+Doxorubicin یاخود Mitoxantron, Dacarbazin +5-Fu.

کاتێک دەرەتانی نەشـتەرگەریی ئەم دوو کارسـینۆمە نەبێ، دەکرێ کەڵک لە تیشـکدەرمانی و هەنگاوگەلی سـوکناییدەر وەربگیرێ. لە کارسـینۆمی پەرەگرتووی ئاناپلاسـتیکدا دەرەتانی کەڵکوەرگرتن لە

---

688 Electrocoagulation
689 Bipolar forceps
690 lupe glasses
691 Hormone therapy
692 Suppression therapy
693 Anthracycline
694 Bleomycine

نەشـــتەرگەریی چـاککەرەوە نییە، بەڵکو تەنهـا دەکرێ لە ڕێگـەی تیشکدەرمانییەوە یاریدەی ئەم نەخۆشانە بدرێ.

## دوابینی

درێژبوونی تەمەن لە تەواوی چەشنەکاندا بۆ ١٠ ساڵ:

* کارسینۆمی پاپیلاریی تیرۆید لە سەرەوەی ٩٠٪ەوەیە.

* کارســـینۆمی فۆلیکولاری تیرۆید ٧٥٪ە، (دوابینی: تەمەنی ژێرەوەی ٤٥ ساڵ باشترە لە تەمەنی سەرەوەی ٤٥ ساڵ).

* کارسینۆمی مێدولاری تیرۆید نزیکەی ٥٠٪یە.

* کارسـینۆمی ئاناپلاسـتیکی تیرۆید: مامناوەندیی زیندوومانەوەیان ٦ مانگە.

# سەرچاوەکان

1- Pramod K Sharma, MD: Chief Editor: Arlen D Meyers, MD, MBA ...Thyroid Cancer.Updated: May 2, 2014. http://emedicine.medscape.com/article/851968-overview

2- Fazia Mir, MD: Chief Editor: Keith K Vaux, MD Medullary Thyroid Cancer and RET.... Updated: Dec 18, 2014. http://emedicine.medscape.com/article/1744824-overview

3- Eric J Lentsch, MD: Chief Editor: Jules E Harris, MD. Thyroid Cancer Staging.Updated: Sep 6, 2013. http://emedicine.medscape.com/article/2006643-overview

4- J. Lary Jameson, Anthony P. Weetman. Thyroid CancerHarrison's Principales of Internal Medicine, 17[th] Edition, Volume II, 2008

5- Paul Ladenson and Matthew Kim, Thyroid Cancer , Cecil Medicine 23[rd] edition 2008

6- Tobias Carling and Robert Udelsman. Thyroid Tumors, Cancer, Principels&Practice of Oncology 8[Th] Edition, Lippincott Williams& Wilkins

7- G. Brabant. Schilddrüsenkarziome, Die Onkologie 2.Auflage, Springer, 2010

8- Cady B beyond risk groups –a new look at differentiated thyroid cancer.surgery 124: 947-957 (1998)

9- Dralle H,sekulla C(2005) Schilddrüsenchirurgie : Generalist oder Spezialist ? Zentralbl Chir 130: 428-433

10 Passler C. Scheuba C, Prager G, Kaczirk K Kaserer K, Zetting G, Niederle B (2004) prognostig factors of pappilary and follicular thyroid cancer: differencees in an iodnereplete endemic goiter region.Endoct Relat Cancer 11: 131-139

11- .Rawat N, Khetan N, Williams DW, Baxter JN (2005) parathyroid carcinoma. Br J Surg92: 1345-1353

12- Sobin LH, Wittekind C (2002) TNM classification of malignant tumours. Sixth Edition.Wiley- Liss, New York 52-56

13- Steurer M, Passler C, Denk DM, Schneider B, Mancusi G, Schickinger B, Niederle B, Bigenzahn w (2003)functionallaryngeal results after 196dvanced196a196at and extensive recurrent laryngeal nerve dissection 196dvance neuromoniitoring – an analysis of more than 1000 nerves at rsc. Eur Surg 35: 262-267

14- Shatavi H ,(Hrsg.) Ostermann G,(1996)Palliative Tumor Chirurgie und Adjuvante Maßnahmen Ab.29

15- Sungler P, Niederle B (2006)surgical treatment of thyroid carcinoma. Eur Surg : 38/1: 1-4

16- Thompson SD, Prichard AJ (2004) The management of parathyroid carcinoma. Curr Opin Otolaryngol Head Neck Surg 12, 93-97
17- Thomusch O, Dralle H (2000) Endokrine Chirurgie und evidenz-basierte Medizin.Chirurg 71 : 635-645
18- Udelsman R, Shaha AR (2005) Is total 197dvanced197a197at the best possible surgical management for well –differentiated thyrod cancer ? Lancet Oncol 6 : 529-531
19- Gabriella Pellegriti, Francesco Frasca, Concetto Regalbuto, Sebastiano Squatrito and Riccardo Vigneri. Worldwide Increasing Incidence of Thyroid Cancer: Update on Epidemiology and Risk Factors, Journal of Cancer Epidemiology Volume 2013 (2013), Article ID 965212, 10 pages. http://dx.doi.org/10.1155/2013/965212. http://www.hindawi.com/journals/jce/2013/965212/
20- www.awmf-online.de/ Leitlinien AWMF
21- www.krebsgesellschaft.de Germany Carcinoma Association
22- www.aco-asso.at/ag/association.org/guiidelines.htm British Thyroid Association
23-
.www.nccn.org/professionals/physician_gls/PDF/thyroid.pdfNational comprehensive Cancer Network
24- www.thyroid.org/ the American Thyroid Association.

## بەش دەیەم

### شێرپەنجەی مەمک[695]

### پەتاناسی

کارسینۆمی مەمک باوترین شێرپەنجەی ژنانە لە جیهاندا. لە وڵاتە پێشکەوتووە پیشەسازییەکانی ڕۆژئاوا لە هەر هەشت تا دە ژن یەکیان لە درێژایی ژیانی خۆیدا تووشی شێرپەنجەی مەمک دەبێ. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پاش شێرپەنجەی سییەکان، کارسینۆمی مەمک دووەمین هۆی مردنی ژنانە. ڕادەی مردن بە هۆی کارسینۆمی مەمک لە ڕۆژهەڵات و باشووری ئورووپا لە نێوان ١٨،١ -١٧،٩ لە هەر ١٠٠٠٠٠ کەس و وڵاتەکانی ڕۆژئاوا و باکووری ئورووپا لە نێوان ٢٢،٦-٢٢،٣ لە هەر ١٠٠٠٠٠ کەسدایە (Bary 2002). سەرەکیترین هۆی مردنی ژنان لە تەمەنی ٣٥ هەتا ٤٥ ساڵی کارسینۆمی مەمکە. ئێستاکە ڕادەی مەترسیی مردنی ژنێک بە هۆی ئەم نەخۆشییە ١:٣٠یە (Feuer et al.1993). لە پیاواندا کارسینۆمی

---

695 Breast Cancer

مەمک بە دەگمەن دەبینرێ و ڕادەی ســـەرهەڵدانی ١ لە هەر ١٠٠٠٠٠ پیاوە. مامناوەندیی ســـەرهەڵدانی لە نێو پیاواندا لە نێوان تەمەنی ٦٠-٧٠ ســـاڵیدایە (La Vecchia et al.1992). لە دوایین دەیەی کۆتایی ســەدەی بیســتدا لە تەواوی جیهان و بە تایبەتی لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا چوونەســـەرەوەی ڕادەی ســەرهەڵدانی شــێرپەنجەی مەمک لە ژناندا دیتراوە. لەوە دەچێ ســـکپری لە تەمەنی ســـەرەوە، ڕێژەی کەمی منداڵداربوون و نەزۆکی، هەروەها ئاڵوگۆڕ لە شـــێوەی ژیاندا وەکو: شـــێوە و ڕژیمی خواردنی ڕۆژئاوایی (زێدەوزەی وەرگیراو بە هۆی خواردنی درێژخایەنی گۆشـــت، چەوری، کاربۆهایدرات)، دابەزینی چالاکی و جموجووڵی جەســـتەیی، چوونەســـەرەوەی کێشـــی لەش، بەکـارهێنـانی هۆرمۆنەکـانی ئێکزۆژێن بۆ بەرگری لە ســـکپری و دەرمانی نیشـــانەکانی لەزگوەســـتانەوە (یائیســـەگی) کاریگەرییەکی بەرچاویان لەم ڕەوتەدا هەبێ. لە ســـەرەتای ســـەدەی ٢١ی زایینیدا دابەزینی ڕادەی شێرپەنجەی مەمک لە بەشێک لە وڵاتە ڕۆژئاواییەکان وەکو بریتانیا، فەڕانسە و ئوستراليا دیتراوە. ساڵی ٢٠٠٨ زایینی ١,٣٨ میلیۆن شـــێرپەنجەی هێرشـــبەری تازەی مەمک[٦٩٦] لە جیهاندا تۆمار کراوە. لە ساڵی ٢٠٠٨دا ڕادەی سەرهەڵدانی شێرپەنجەی مەمکی ژنان لە نێوان ١٩,٣ لە هەر ١٠٠٠٠٠ کەس لە ڕۆژهەڵاتی ئەفریقا هەتا ٨٩,٩ لە هەر ١٠٠٠٠٠ کەس لە ڕۆژئـاوای ئـورووپـادا بـووە. بە هـۆی دیاریکردنی پێشـوەخت و شـێوە پێشـکەوتووەکانی دەرمانەوە، ڕادەی مردن بە هۆی ئەم نەخۆشییەوە لە ٢٥ ساڵی ڕابوردوودا لە باکووری ئەمەریکا و بەشـــێک لە وڵاتە ئورووپاییەکان دابەزیوە. لە زۆربەی وڵاتانی ئەفریقایی و ئاسـیایی (ئۆگەندا، باشـووری کۆریا و هیندسـتان ڕادەی مردن بە هۆی شـــێرپەنجەی مەمـک چووەتە ســـەرێ. لە باشـووری کوردسـتان "بەگوێرەی ئامارەکانی وەزارەتی تەندروسـتیی هەرێمی کوردسـتان، لە ساڵی ٢٠٠٤ تا ٢٠١٢ نزیکەی ٨٠٠٠ نەخۆشی

---

[696] Invasive breast cancer

شێرپەنجە تۆمار کراون، هەروەها ٤٠٠٠ توشبووی دیکەش کە خەڵکی دەرەوەی هەرێم بوون، چارەسەریان بۆ کراوە، تەنها لە ساڵی ٢٠١١ و ٢٠١٢دا نزیکەی ٧٠٠ ژن تووشــی شــێرپەنجەی مەمک بوون کە تەنها لە ساڵی ٢٠١٢دا ٥٥ کەس بەم هۆیەوە گیانیان لە دەست داوە، زۆرترین جۆری شێرپەنجەش لە کوردستان شێرپەنجەی سییەکانە کە هۆکارەکەی جگەرەکێشانە و لە ژنانیشدا شێرپەنجەی مەمک لە پلەی یەکەمدایە." لە ئێران لە هەر ١٠٠٠٠٠ ژن ٢٧/١٥ کەس تووشــی شــێرپەنجەی مەمک دەبن. ئەم نەخۆشــییە وەکو وڵاتەکانی دیکەی جیهان باوترین شێرپەنجەی ژنانە، ساڵانە نزیکەی ٨٤٠٠ ژن تووشی کارسینۆمی مەمک دەبن کە لەمانە ٧٧٧٨ کەسیان ئێرانین و ئەوانەی دیکە خەڵکی بیانیی دانیشتووی ئێرانن. ئەم ڕێژەیە بە بەراورد لەگەڵ وڵاتە پێشــکەوتووەکاندا تا ڕادەیەک جیاوازیی هەیە. بەپێی ڕاپۆرتی ناوەندی لێکۆڵینەوەی شــێرپەنجەی ئێران، ڕێژەی ســەرهەڵدانی ئەم نەخۆشــییە لە نێوان پیاوانی ئێرانیدا زۆرترە لە وڵاتە ڕۆژئاواییەکان و بەرامبەر بە ســەدی ٢/٨ی شــێرپەنجەی مەمکە. شــێرپەنجەی مەمک پێنجەمین هۆی مردنی ژنانی ئێرانییە بە هۆی شــێرپەنجەوە. ئێســتا بکوژترین شــێرپەنجە لە نێوان ژن و پیاوانی ئێرانیدا شــێرپەنجەی گەدەیە.

**فاکتەرە ڕێخۆشکەرەکان:**

هۆی شــێرپەنجەی مەمک نەناســراو ماوەتەوە. هێندێک لە فاکتەرە ڕێخۆشکەرەکانی شێرپەنجەی مەمک بریتین لە:

* تەمەن: مەترسیی شێرپەنجەی مەمک پاش تەمەنی ٤٠ ساڵیی ژنان بەرز دەبێتەوە. بەپێی لێکۆڵینەوەکانی (SEER)[٦٩٧]، ڕادەی مەترســیی سەرهەڵدانی شێرپەنجەی هێرشبەری مەمک بۆ ژنانی ژێرەوەی پەنجا ساڵ ٤٤ لە هەر ١٠٠٠٠٠ کەس و لە ژنانی سەرەوەی ٥٠ ساڵ ٣٤٥

697 Surveillance, Epidemiology and End Results

له هەر ١٠٠٠٠٠ کەسدایە. سەرلوتکەی سەرهەڵدانی ئەم شێرپەنجەیە لە دەوروبەری ٥٠ساڵی و ٧٠ ساڵیدایە.

* پێشینە و بوونی ئەم نەخۆشییە لە بنەماڵەدا: ڕادەی سەرهەڵدانی لەوانەی کە دایک یان خوشکیان تووشی شێرپەنجەی مەمک بووە، چوار جار و لەوانەی کە دوو یان زۆرتر لە دوو کەس لە خزم و کەسی پلەی یەکیان تووشی ئەم نەخۆشییە بوون، هەتا نزیکەی ٥ جار بەرز دەبێتەوە. پێشینەی شێرپەنجەی هێلکەدان لە خزم و کەسی پلەی یەکی نەخۆش، بە تایبەتیی کاتێک پێش تەمەنی ٥٠ ساڵییان سەری هەڵدابێ، لەوە دەچێ ڕادەی مەترسیی شێرپەنجەی مەمک دووقات بەرز بکاتەوە. زۆر جار ئەمە کاردانەوەی موتاسیۆنی میراتی و پاتۆژێنیک لە ژێنەکانی BRCA1 یان BRCA2دایە.

* دەستپێکردنی پێشوەختی بێنوێژی (پێش ١٢ ساڵی).

* لەزگوەستانەوەی درەنگوەخت (پاش ٥٥ ساڵی).

* سکپڕی و زایینی هەوەڵ منداڵ پاش تەمەنی ٢٥ ساڵ.

* نەزۆکی.

* بەکارهێنانی درێژخایەنی سترۆژێن.

* قەڵەویی پاش لەزگوەستانەوە.

* بوون لەژێر کاریگەریی تیشکی یۆنیزاندا[٦٩٨] (بۆ وێنە، لە کاتی دەرمانی نەخۆشیی هۆچکیندا).

* زۆرخواردنەوەی ئەلکول.

* جگەرەکێشان.

[698] Ionizing radiation exposure

## قەوارە و کاری مەمک




مەمکی ژنی پێگەیشــتوو لە چەشــنی ڕژێنی دروســتکەری شــیرە و پێکهاتەیەکە لە تان و پۆی هاوبەســــت[٦٩٩]، چەوری، لۆب، لۆبوول[٧٠٠]، بۆری[٧٠١] و لیمفەگرێکان. هەر مەمکێک ١٥ هەتا ٢٠ لۆب لە خۆ دەگرێ. چەوریی دەوری ئەم لۆبانە دەبێتە هۆی شــکڵگرتنی ئەندازە و فۆرمی مەمـک. هەر کـام لەم لۆبـانە لە چەنـدین لۆبوول پێـک هـاتوون و لە کۆتایی هەر کامیاندا ڕژێنەکان هەن کە ئەرکیان دروســتکردنی شــیرە. لۆبەکـان لە ڕێگەی تان و پۆی هاوبەســــتی لیفییەوە بەیەکەوە لکاون. لۆبوولەکـان یەکەی دەڵانـدنی مەمکن. ئەســــتووریی هەر لۆبوولێـک نزیکەی نیو هەتا یەک میلیمەترە. ئەرکی سەرەکیی مەمک دروستکردن و دەڵاندنی شــــیرە. پاش لـەدایکبوونی منداڵ، مەمکی دایک بە هۆی کاریگەریی هۆرمۆنی ژنانەی ســــترۆژێن و پرۆژســــترۆن لەوپەڕی گەشــــەکردنی خۆیدایە و ڕژێنی دەڵاوی مەمک گەورەتر و بۆرییەکان

---

[699] Connective tissue
[700] Lobules
[701] Ducts

والاتر له هەمیشـــەن. ئەم رژێنانە لەژێر کاریگەریی هۆرمۆنی پرۆلاکتینی هیپۆفیزی مێشـــکدا چالاک دەبن و لەواندا ڕەوتی دروســـتکردن و پاشـەکەوتکردنی شیر دەست پێ دەکات. بەردەوامیی ڕەوتی دروستبوون و دەلاندنی شیر لە پێوەندی لەگەڵ مەمکمژینی منداڵدایە.




**لە ڕوانگەی ئۆنکۆلۆژیەوە مەمک بۆ چواربەش دابەش دەکرێ:**

* یەک لە چواری سەرووی دەرەکی (سوپێرۆلاترال)[٧٠٢].
* یەک لە چواری سەرووی ژوورەکی (سوپێرۆمیدیال)[٧٠٣].
* یەک لە چواری خوارووی دەرەکی (ئینفێریۆلاترال)[٧٠٤].
* یەک لە چواری خوارووی ژوورەکی (ئینفێریۆمیدیال)[٧٠٥].

---

702 Upper outer (superolateral) quadrant
703 Upper inner (superomedial) quadrant
704 Lower outer (inferolateral) quadrant
705 Lower inner (inferomedial) quadrant

**لیمفەگرێکانی مەمک بریتین لە:**

* لیمفەگرێکانی سەرەوەی چەڵەمەی سینگ (سوپراکلاویکولار)[٧٠٦].
* لیمفەگرێکانی ژێرەوەی چەڵەمەی سینگ (ئینفراکلاویکولار)[٧٠٧].
* لیمفەگرێکانی بنهەنگڵ (ئاکسیلار)[٧٠٨].
* لیمفەگرێکانی نێو مەمک[٧٠٩].

## پاتۆلۆژی

زۆربەی شێرپەنجەکانی مەمک لە چەشنی کارسینۆمەکانی دەڵاوی (ئینفیلتراتیڤی) بۆرین. بەشێکی کەم لەوانە لە چەشنی کارسینۆمەکانی دەڵاوی لۆبوولارن.



پرۆگنۆزی کارسینۆمەکانی موسینی و توبۆلی باشترن. لە تەواوی ئەو نەخۆشانەدا کە تووشی شێرپەنجەی مەمک بوون، پێویستە چۆنێتیی وەرگرەکانی ستروژێن[٧١٠] و پرۆژێسترۆنی[٧١١]

---

706 Supraclavicular nodes
707 Infraclavicular nodes
708 Axillary nodes
709 Internal mammary nodes
710 Estrogen
711 Progesterone

تومۆری ســـــەرەکی ڕوون بکرێتەوە. ئۆنکۆپرۆتین[٧١٢] – ئۆنکۆژین HER-2/neu (وەرگرەکـانی فـاکتــەری گەشـــەکردنی ئێپـیـدێرمیی مرۆڤ[٧١٣]) ڕۆڵی بەرچاویـان لە پێناســـەکردنی پرۆگنۆز و دەرمـانی شــــێرپەنجەی مەمکدا هەیە. ئەو تومۆرانە کە لە بـاری وەرگرەکـانی ســــتروژێن و زۆربوونی لەڕادەبەدەری ئۆنکۆژێنی HER-2 (یـانی تومۆرەکانی نەرێنیی سێیانە) نەرێنین، پرۆگنۆزێکی خراپیان هەیە. ئەو نیشـانانەی کە باس کران، تایبەتن بە ســەرهەڵدانی تومۆر لەو ژنانەدا کە ژێنی ڕێخۆشکەرەی شێرپەنجەی مەمکیان هەیە.

**چەشنەکانی شێرپەنجەی مەمک بەپێی ڕادەی سەرهەڵدانیان بەم چەشنەن:**

* کارسینۆمی دەڵاوی بۆری[٧١٤] باوترین چەشنی دیاریکراوی تومۆری مەمکە و ٧٥٪ی شـــێرپەنجەی مەمـک لە خۆ دەگرێ و لە ڕێگـەی لیمفەکانەوە تەشەنە دەکا.
* لە ٢٥ ســـاڵی ڕابوردوودا ڕادەی ســـەرهەڵدانی کارســـینۆمی لە جێی لۆبوولار[٧١٥] دووقات بووەتەوە و ئێسـتا گەیشـتووە بە ٢٨ لە هەر ١٠٠٠٠٠ ژندا. لوتکەی سەرهەڵدانی لە ژناندا تەمەنی نێوان ٤٠ هەتا ٥٠ ساڵە.
* کـارســــینۆمی دەڵێنراوی لۆبوولار[٧١٦] هۆی ١٥٪ی شــــێرپەنجەی هێرشبەری مەمکە.
* کارسـینۆمی مێدولار[٧١٧] هۆی ٥٪ی شـێرپەنجەی مەمکە و زۆرتر لە ژنە گەنجەکاندا سەرهەڵدەدا.
* کارسـینۆمی موسـینی (کالۆید)[٧١٨] هۆی کەمتر ٥لە ٪ی شـێرپەنجەی هێرشنەکەری مەمکە.

---

712 Oncoprotein
713 Human epidermal growth factor receptor 2 (HER2
714 Infiltrating ductal carcinoma
715 Lobular carcinoma in situ (LCIS)
716 Infiltrating lobular carcinoma
717 Medullary carcinoma
718 Mucinous (colloid) carcinoma

* کارسینۆمی توبوولار[719] هۆی ١٪ هەتا ٢٪ی شێرپەنجەی مەمکە.
* شـــێرپەنجەی پاپیلاری[720] زۆرتر لە ژنانی ســـەرەوەی ٦٠ ســـاڵیدا سەرهەڵدەدا و هۆی نزیکەی ١٪ هەتا ٢٪ی شێرپەنجەی مەمکە.
* شێرپەنجەی مێتاپلاستیکی مەمک[721] هۆی کەمتر ١٪ی شێرپەنجەی مەمکە و زۆرتر لە ژنە بەتەمەنەکاندا دەبینرێ (مـامنـاوەنـدیی تەمەنی ســەرهەڵدانی لە دەیەی شـەشـەمی ژیاندایە) و ڕادەی ســەرهەڵدانی لە ڕەشەکاندا بەرزە.
* نەخۆشیی پەجێتی مەمک[722] هۆی ١٪ هەتا ٤٪ی شێرپەنجەی مەمکە و لوتکەی ســـەرهەڵدانی لە دەیەی شـــەشـــەمی ژیاندایە (مامناوەندیی تەمەن ٥٧ ساڵە).



چەشنی لوبولاری شیرپەنجەی مەمک کە پیشاندەری خانە مترسییدارەکان لە شیوەی تاکە زنجیرەیەک یاخود تاکە ریزکدایە

---

719 Tubular carcinoma
720 Papillary carcinoma
721 Metaplastic breastcancer
722 Mammary Paget disease

# پۆلبەندیی تی ئێن ئێمی کارسینۆمی مەمک




| | (T)تومۆری سەرەتایی |
|---|---|
| TX | تومۆری سەرەتایی بۆ هەڵسەنگاندن نابێ. |
| T0 | نیشانێک لە تومۆری سەرەکی نییە. |
| Tis | کارسینۆم لە جێدایە (مەبەست ئەوەیە لە شوێنی سەرەکیی خۆیدایە). |
| Tis (DCIS) | کارسینۆمی بۆریی لە جێ. (ئەو شێرپەنجەیە کە لە خانەکانی بۆریی مەمکەوە سەرچاوەی گرتبێ). |
| Tis (LCIS) | کارسینۆمی لۆبوولاری لە جێ (کاتێک خانەکانی لۆبوول سەرچاوەی شێرپەنجە بن). |
| Tis (Paget) | نەخۆشیی پەجێتی گۆی مەمک پێوەندی لەگەڵ کارسینۆمی هێرشبەر و / یان کارسینۆمی لە جێ (DCIS و LCIS) نییە. |
| T1 | ئەندازەی تومۆر ٢٠ میلیمەتر یان چکۆلەترە. |
| T1mi | ئەندازەی تومۆر ١ میلیمەتر یان چکۆلەترە. |
| T1a | ئەندازەی تومۆر گەورەترە لە یەک میلیمەتر، بەڵام بەرامبەر یان چکۆلەترە لە ٥ میلیمەتر. |

| | |
|---|---|
| T1b | ئەندازەی تومۆر گەورەترە لە ٥ میلیمەتر، بەڵام بەرامبەر یان چکۆلەترە لە ١٠ میلیمەتر. |
| T1c | ئەندازەی تومۆر گەورەترە لە ١٠ میلیمەتر، بەڵام بەرامبەر یان چکۆلەترە لە ٢٠ میلیمەتر. |
| T2 | ئەندازەی تومۆر گەورەترە لە ٢٠ میلیمەتر، بەڵام بەرامبەر یان چکۆلەترە لە ٥٠ میلیمەتر. |
| T3 | تومۆر گەورەترە لە ٥٠ میلیمەتر. |
| T4 | تومۆر بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەندازەکەی،کە ڕاستەوخۆ بۆ نێو دیواری سینگ و /یان پێست (برین یان گرێکانی پێست) تەشەنەی کردبێ. |
| T4a | بڵاوبوونەوەی تومۆر لە دیواری سینگدا. |
| T4b | سەرهەڵدانی برین و / یان وردەگرێ و / یان ماسینی پێستی ئەو لایەی کە تووشی کارسینۆم بووە و بواری هەوەکارسینۆم[٧٢٣] لە خۆ ناگرێتەوە. |
| T4c | نیشانەکانی هەر دوو حاڵەتی **T4b** و **T4a** دەبینرێن. |
| T4d | هەوەکارسینۆم |
| | لیمفەگرێ ناوچەییەکان (**N**) |
| کلینیکال | |
| NX | لیمفەگرێ ناوچەییەکان بۆ هەڵسەنگاندن نابن. |
| N0 | تەشەنەکردنی شێرپەنجە بۆ لیمفەگرێکان نابینرێ. |
| N1 | تەشەنەکردنی شێرپەنجە لە ئاستی **I** و **II**ی لیمفەگرێ بزۆکییەکان (بەجووڵەکان) بنهەنگڵی (ئاکسیلاری) ئەو لایەی کە تووشی کارسینۆم بووە. |

723 Inflammatory carcinoma

| | |
|---|---|
| تەشەنەی شێرپەنجە لە ئاستی I و IIی لیمفەگرێ بنهەنگڵییەکان (ئاکسیلاری) ئەو لایەی کە تووشی کارسینۆم بووە و لەباری کلینیکییەوە نەگۆڕ (جێگیر، نەجوولاو) یان چرۆچنگ لەیەکداو و پەستراوە یان لە کاتی تێڕوانینی لەش و وێنەگرتندا (بێجگە لە لیمفۆسینتۆگرافی) لیمفەگرێ ژوورەکییەکانی مەمک لە نەبوونی نیشانەکانی ئاشکرای کلینیکیی میتاستازی لیمفەگرێکانی بنباخەڵ دیاری کرابێ. | N2 |
| تەشەنەی شێرپەنجە لە ئاستی I و IIی لیمفەگرێ بنهەنگڵییەکان (ئاکسیلاری) ئەو لایەی کە تووشی کارسینۆم بووە و بەیەکەوە یان پێکهاتەکانی (ستروکتوورەکانی) دیکەوە لکاون. | N2a |
| میتاستاز کە تەنها لە کاتی تێڕوانینی لەش و وێنەگرتن (بێجگە لە لیمفۆسینتۆگرافی) لیمفەگرێ ژوورەکییەکانی مەمک لە نەبوونی نیشانەکانی ئاشکرای کلینیکیی میتاستازی لیمفەگرێکانی بنباخەڵ دیاری کرابێ. | N2b |
| میتاستاز لە گرێکانی ژێرەوەی چەڵەمەی سینگ (ئاستی III بنهەنگڵ) لەگەڵ یان بەبێ تووشبوون لە ئاستی I و IIی گرێکانی بنهەنگڵ یان دیاریکردن لە کاتی تێڕوانین و وێنەگرتنی لیمفەگرێ ژوورەکییەکانی مەمک لەو لایەی کە تووشی شێرپەنجە بووە لەگەڵ یان بەبێ تووشبوونی لیمفەگرێ بنهەنگڵی یان ژوورەکییەکانی مەمک. | N3 |
| میتاستاز بە گرێکانی ژێرەوەی چەڵەمەی سینگ. | N3a |
| میتاستاز بە گرێ ژوورەکییەکانی مەمک و بنهەنگڵ. | N3b |
| میتاستاز بە گرێکانی سەرووی چەڵەمەی سینگ. | N3c |

| | |
|---|---|
| | پاتۆلۆژیک (pN) |
| pNX | لیمفەگرێ ناوچەییەکان بۆ هەڵسەنگاندن نابن (بۆ وێنە یان لەوەوپێش پاش بڕین جیا کراونەتەوە یان بۆ لێکۆڵینەوی خەسارناسی (پاتۆلۆژیک) جیانەکراوەن.) |
| pN0 | لەباری هیستۆلۆژیکەوە مێتاستازی لیمفەگرێ ناوچەییەکان دیاری نەکراون. سەرنج: کۆمەڵێک (هێشوویەک) لە خانە تەریککەوتووەکانی تومۆر[٧٢٤] وەکو هێشوویەکی بچووک لە خانەکانی بەرامبەر یان چکۆلەتر لە ٠,٢ میلیمەتر، یان خانەکانی تاکە تومۆر[٧٢٥]، یان کۆمەڵێکی پێکهاتوو لە کەمتر لە ٢٠٠ خانە لە تاکە بڕگەیەکی (نموونە)[٧٢٦] هیستۆلۆژیکیدا پێناسە دەکرێ؛ لەوە دەچێ خانە تەریککەوتووەکانی تومۆر بە یاریدەی شێوازەکانی (مێتۆدی) هیستۆلۆژیک یان ئیمۆنۆهیستۆشیمیکال[٧٢٧] دیاری بکرێن؛ هەر چەند ئەو گرێیانە کە تەنها خانە تەریککەوتووەکانی تومۆریان هەیە، لە کۆی گرێ ئەرێنییەکان بە مەبەستی پلەبەندیکردنی N جیا دەکرێنەوە، بەڵام پێویستە ئەوانیش لە چوارچێوەی سەرجەمی گرێکاندا هەڵسەنگێنرێن. |
| pN0(i-) | لەباری هیستۆلۆژییەوە نیشانەیەک لە مێتاستازی لیمفەگرێ ناوچەییەکان نییە، ئاکامی تاقیکردنەوەی ئیمۆنۆهیستۆشیمیکال نەرێنییە. |

724 Isolated tumor cell clusters
725 Single tumor cells
726 Cross-section
727 Immunohistochemical

| | |
|---|---|
| ئەندازەی خانە مەترسیدارەکانی لیمفەگری ناوچەییەکان بەرامبەر یان چکۆلەترە لە ٢ میلیمەتر. | pN0(i+) |
| لەباری هیستۆلۆژیکییەوە نیشانەیەک لە میتاستازی لیمفەگری ناوچەییەکان نییە، دۆزراوەکانی مۆلیکۆلی نەرێنین (کاردانەوەی زنجیرەیی ترانس کریپتازی ئاوەژوو[٧٢٨] [RT-PCR]). | pN0 (mol-) |
| دۆزراوەکانی مۆلیکۆلی ئەرێنین [RT-PCR] بەڵام لە باری هیستۆلۆژی یان تاقیکردنەوەی ئیمۆنۆهیستۆشیمیکالییەوە میتاستازی لیمفەگری ناوچەییەکان دیاری ناکرێ. | pN0 (mol+) |
| میکرۆمیتاستاز یان میتاستاز بە یەک هەتا سێ لیمفەگری بنهەنگڵ و /یان گری ژوورەکییەکانی مەمک، بە میتاستازەوە کە لە ڕێگەی بەکارهێنانی بیوپسی لیمفەگرێکانی پێشەنگ[٧٢٩] دیاری دەکرێن، بەڵام لە باری کلینیکییەوە دەستنیشان نەکراون. | pN1 |
| میکرۆمیتاستازەکان (گەورەتر لە ٠,٢ میلیمەتر و /یان زۆرتر لە ٢٠٠ خانە، بەڵام لە ٠,٢ میلیمەتر گەورەتر نییە). | pN1mi |
| میتاستاز بە یەک هەتا سێ لیمفەگریی بنهەنگڵ (بە لایەنی کەم پانتایی میتاستازێکی پتر لە ٢ میلیمەتر بێ). | pN1a |
| میتاستاز بە لیمفەگری ژوورەکییەکانی مەمک لەگەڵ میکرۆمیتاستاز یان ماکرۆمیتاستاز کە لە ڕێگەی | pN1b |

[٧٢٨] Reverse transcriptase polymerase chain reaction

[٧٢٩] مەبەست لە هەوەڵین لیمفەگرییەکە کە تا ڕادەیەکی زۆر لەوە دەچێ خانەکانی کانسەر لە تومۆری سەرەکییەوە لەوانەوە تەشەنەیان کردبێ.

| | |
|---|---|
| | بیوپسی لیمفەگرێی پێشەنگ دیاری دەکرێ، بەڵام لە باری کلینیکییەوە دەستنیشان نەکراوە. |
| pN1c | میتاستاز بە یەک هەتا سێ لیمفەگرێ بنهەنگڵی و ژوورەکییەکانی مەمک لەگەڵ میکرۆ یان ماکرۆمیتاستاز کە لە ڕێگەی بیوپسی لیمفەگرێی پێشەنگ دیاری دەکرێ، بەڵام لە باری کلینیکییەوە دەستنیشان نەکراوە. |
| pN2 | میتاستاز بە چوار هەتا نۆ لیمفەگرێی بنهەنگڵ یاخود دیاریکردنی لیمفەگرێکانی ئەو لایەی کە تووشی شێرپەنجە بووە لە ڕێگەی کلینیکییەوە لە درێژایی .A Mammaria interna بەبێ هەبوونی میتاستاز لە لیمفەگرێکانی بنهەنگڵ. |
| pN2a | میتاستاز بە ٤ هەتا نۆ لیمفەگرێی بنهەنگڵ (بە لایەنی کەم پانتایی یەکیان لە ٢ میلیمەتر پتر بێ). |
| pN2b | دەستنیشانکردنی کلینیکیی میتاستازی لیمفەگرێ ژوورەکییەکانی مەمک لە نەبوونی میتاستاز لە لیمفەگرێکانی بنهەنگڵدا. |
| pN3 | میتاستاز بە ١٠ ≤ لیمفەگرێی بنهەنگڵ؛ یان لە لیمفەگرێکانی ژێرەوەی چەڵەمەی سینگ (ئاستیIII بنهەنگڵ)؛ یان دیاریکردنی کلینیکی لە لیمفەگرێ ژوورەکییەکانی مەمک لە کاتی بوونی ئاستی ئەرێنیی I و yII لیمفەگرێکانی بنهەنگڵ؛ یان پتر لە ٣ لیمفەگرێی بنهەنگڵ و ژوورەکیی مەمک، لەگەڵ میکرۆ و ماکرۆمیتاستاز کە لە ڕێگەی بیوپسیی لیمفەگرێی پێشەنگ دیاری دەکرێ، بەڵام لە باری کلینیکییەوە نەدۆزراوەتەوە؛ یان لە لیمفەگرێکانی سەرەوەی |

| | |
|---|---|
| | چەڵەمەی سینگی ئەو لایەی کە تووشی شێرپەنجە بووە. |
| pN3a | مێتاستاز بە ١٠ ≥ لیمفەگرێی بنهەنگڵ (لایەنی کەم پانتایی تومۆرێکیان لە ٢ میلیمەتر پتر بێ)؛ یان مێتاستاز بە لیمفەگرێکانی ژێرەوەی چەڵەمەی سینگ (ئاستی III گرێکانی بنهەنگڵ). |
| pN3b | مێتاستاز بە لیمفەگرێ ژوورەکییەکانی مەمک لە هەبوونی پتر لە یەک لیمفەگرێی ئەرێنیی بنهەنگڵ لە ڕێگەی کلینیکییەوە؛ یان لە پتر لە ٣ لیمفەگرێی بنهەنگڵ و ژوورەکیی مەمک، لەگەڵ میکرۆ یان ماکرۆمێتاستازەکان کە لە ڕێگەی بیوپسیی لیمفەگرێی پێشەنگ دیاری دەکرێن، بەڵام لە ڕێگەی کلینیکییەوە نەدۆزراونەتەوە. |
| pN3c | مێتاستاز بە لیمفەگرێکانی سەرەوەی چەڵەمەی سینگی ئەو لایەی کە تووشی شێرپەنجە بووە. |
| | (m) مێتاستازی دوور |
| M0 | نەبوونی نیشانەیەکی کلینیکی یان ڕادیۆگرافیک بۆ مێتاستازی دوور. |
| cM0(i+) | هیچ نیشانەیەکی کلینیکی یان ڕادیۆگرافیک بۆ مێتاستازی دوور نییە، بەڵام خانەکانی تومۆر لە سووڕانی خوێن، مۆخی ئێسک یان تان و پۆیەکانی دیکەی گرێی ناناوچەیی کە لە ٠,٢ میلیمەتر گەورەتر نین، لە نەخۆشەکاندا بەبێ سەرهەڵدانی نیشانەکانی مێتاستاز دەدۆزێتەوە. |
| M1 | هەبوونی مێتاستازی دوور کە لە ڕێگەی شێوە کلاسیکییەکانی کلینیکی و ڕادیۆلۆژیکی یان هیستۆلۆژیکی دیاری دەکرێ. |

| پلەبەندیی هیستۆلۆژیک (G) | |
|---|---|
| GX | ئەم پلەیە بۆ هەڵسەنگاندن نابێ. |
| G1 | پلەی نزمی هیستۆلۆژیک (دڵخواز). |
| G2 | پلەی نێوەنجیی هیستۆلۆژیک (تا رادەیەک دڵخواز) |
| G3 | پلەی بەرزی هیستۆلۆژیک (نادڵخواز، خراپ). |

**قوناخەکانی قەوارەیی/گرووپەکانی پرۆگنۆستیک (پێشبینی)**

| M | N | T | قۆناخەکان |
|---|---|---|---|
| M0 | N0 | Tis | 0 |
| M0 | N0 | T1 | 1A |
| M0<br>M0 | N1mi<br>N1mi | T0<br>T1 | 1B |
| M0<br>M0<br>M0 | N1<br>N1<br>N0 | T0<br>T1<br>T2 | IIA |
| M0<br>M0 | N1<br>N0 | T2<br>T3 | IIB |

| | | | |
|---|---|---|---|
| IIIA | T0<br>T1<br>T2<br>T3<br>T3 | N2<br>N2<br>N2<br>N1<br>N2 | M0<br>M0<br>M0<br>M0<br>M0 |
| IIIB | T4<br>T4<br>T4 | N0<br>N1<br>N2 | M0<br>M0<br>M0 |
| IIIC | هەر کام لە T-یەکان | N3 | M0 |
| IV | هەر کام لە T-یەکان | هەر کام لە N-ەکان | M1 |

**نیشانەکان**

لەوە دەچێ لە سەرەتادا نیشانەیەکی تایبەتی نەبینرێ، بەڵام بەپێی پەرەسەندنی نەخۆشییەکە ئەم نیشانانە سەرهەڵدەدەن:

* گۆڕانی شکڵ و ئەندازەی مەمک.

* گۆڕانی ڕەنگ و حاڵەتی پێست وەکو پێکهاتنی وردەچاڵایی یان کێشرانی پێست، گۆڕانی شکڵ و ڕەنگی دەوری گۆی مەمک، سەرهەڵدانی برین یان ماسینی پێست، بە تایبەتی کاتێک ڕەنگی وەکو پێستی پرتەقاڵ بێ.

* بەرەوژووورگەڕانەوە یان نائاساییبوونی گۆی مەمک.
* دەلاَنی نائاسایی خوێن یان خوێناو لە بۆرییەکی گۆی مەمک.
* دروستبوونی تومۆر یان تۆپەڵێکی نائاسایی لە مەمک یان بنهەنگڵدا، هەروەها گەورەبوونی لیمفەگرێکانی بنهەنگڵ.
* ئێسکئێشە، پشووسواری، زەردوویی و هتد.... کاتی تەشەنەکردنی شێرپەنجە بۆ ئەندامەکانی دیکە وەکو ئێسک، سییەکان و جگەر.

**دیاریکردن**

دیاریکردنی کارسینۆمی مەمک ئەم بوارانە لە خۆ دەگرێ:

١. کۆکردنەوەی بەسەرهات.

ئاگاداری لە بەسەرهات و چۆنێتیی حاڵی نەخۆش لە هەنگاوە پێویستەکانی دیاریکردنی ئەم نەخۆشییەن. پرسیارەکانی خوارێ لە پێوەندی لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی ئەم نەخۆشییەدا بۆ ڕوونکردنەوەی بارودۆخی نەخۆش پێویستن:

- چۆنێتیی لەزگوەستانەوە.
- دەستپێک و کۆتاییهاتنی بێنوێژی، بارودۆخی نەخۆش لە کاتی پاش بێنوێژیدا.
- دایکبوون (منداڵەکان، ڕێژەی ئەوان و ساڵی لەدایکبوونیان).
- نەشتەرگەریی مەمکی دایک لە ڕابوردوودا/ شێرپەنجەی مەمک.
- بەسەرهات و پێشینەی نەخۆشیی دایک لە ڕابوردوودا، هەروەها تەمەنی خزم و کەسە نزیکەکان کاتێک تووشی گرفتێکی پزیشکی بووبن.

٢. نیشانەکانی شێرپەنجەی مەمک (بڕوانە بەشی نیشانەکان). هەروەها لە کاتی تێڕوانینی مەمکدا ئەم حاڵەتانە سەرنجڕاکێشن:

- ڕەقی.
- ناڕێکوپێکی.
- گرێگرێبوون.

- لکان بە پێست یان ماسولکەوە.
٣. نیشانەکانی وێناگرتنی مەمک:
- ماموٚگرافی.
- سوٚنوٚگرافی.
- کامپیوتێرتوموٚگرافی.
- وێناکردنی زرنگانەوەی موگناتیسی.
- سینتیماموٚگرافی.
- توموٚگرافی بە ڕەوانەکردنی پوٚزیتروٚنەوە.

ماموٚگرافی باوترین ئامرازی دیاریکردنی شێرپەنجەی مەمک و لیمفەگرێکانی بنهەنگڵە لە قوٚناخەکانی سەرەتادا. ماموٚگرافی، بە تایبەتی بوٚ دیاریکردنی ئەو میکروٚکالسیفیکاسیوٚنانە[730]ی کە ڕادەی هەستیارییان ژێرەوەی ١٠٠ μm-ە، بەکەڵکترە. لە ڕێگەی ماموٚگرافییەوە زوٚر جار دەکرێ توموٚری مەمک پێش دیاریکردنی نیشانەکانی شێرپەنجە کاتی تێڕوانینی مەمک بە دەست، دەستنیشان بکرێ. سوٚنوٚگرافی یەکێک لە هەوەڵین هەنگاوە سەرەتاییەکانە بوٚ دیاریکردنی نەخوٚشییەکانی مەمک، بە تایبەتی لەو ژنانەدا کە تەمەنیان ژێرەوەی ٣٠ ساڵە. سوٚنوٚگرافی لە بوارگەلێک کە ماموٚگرافی توانایییەکی باشی بوٚ دەستنیشانکردنی نەخوٚشییەکانی فیبروٚکیستیک یان هەبوونی توپەڵێ نائاسایی نییە، وەکو ئامرازێکی یاریدەدەر کەڵکی لێ وەردەگیرێ. ئەمروٚکە سوٚنوٚگرافی دەورێکی سەرنجڕاکێش و حاشاهەڵنەگر لە هەڵسەنگاندنی شێرپەنجەی مەمکدا دەگێڕێ.

سوٚنوٚگرافی بوٚ هەڵسەنگاندنی خاڵەکانی خوارێ بەکەڵکە:

* ئەو توپەڵە نائاساییانەی مەمک کە کاتی تێڕوانینی مەمک بە دەست دیاری دەکرێن، بەڵام لە ماموٚگرافیدا نابینرێن.

* کاتی گومانکردن لە هەبوونی پاتوٚلوٚژی لە مەمکی ئەو ژنانەدا کە تەمەنیان ژێرەوەی ٣٠ ساڵە.

[730] Microcalcifications

* هەروەها هەبوونی ئەو ئازار و نیشانە نائاساییانە کە لە ماموگرافیدا نابینرێن.

وردبوونی سۆنۆگرافی لە کاتی پەستراوبوونی[731] تان و پۆی مەمک بە بەراورد لەگەڵ ماموگرافی کەمترە، بەڵام سۆنۆگرافی و وێناکردنی زرنگانەوەی موگناتیسی زۆرتر لە ماموگرافی بۆ دیاریکردنی شێرپەنجەی هێرشبەر لە مەمکی بێچەوریدا[732] بەکەڵک و هەستیارترن.

وێناکردنی زرنگانەوەی موگناتیسی (MRI) شێوازێکی یاریدەدەرە بۆ دیاریکردنی شێرپەنجەی مەمک و کاتێک پاش ماموگرافی گومان لە بوونی شێرپەنجە هەبێ، کەڵکی لێ وەردەگیرێ. هەروەها بە یاریدەی MRI، دەکرێ پانتایی و قۆناخی شێرپەنجە بە باشی پێناسە بکرێ. بە گشتی، بۆ وێنە دەکرێ لەم بوارانەدا کەڵک لە MRI وەربگیرێ:

* بە وردی هەڵسەنگاندنی هەرچەشنە نائاساییەکی مەمک کە لە ڕێگەی تێڕوانینی کلینیکی، سۆنۆگرافی و ماموگرافییەوە دۆزراوەتەوە.
* دیاریکردنی شێرپەنجەی شاراوەی مەمک لەو نەخۆشانەدا کە لە لیمفەگرێکانی بنهەنگڵدا تووشی کارسینۆم بوون.
* دۆزینەوەی کارسینۆمی شاراوەی سەرەکی لە کاتی هەبوونی ئادنۆکارسینۆمی تەشەنەکردوو کە سەرچاوەکەی نادیارە.
* دۆزینەوە و دیاریکردنی شێرپەنجەی سەرهەڵداوەی مەمک.[733]
* دیاریکردنی سەرەتایی شێرپەنجەی مەمک کاتێک لە ڕێگەی شێوەکانی دیکەوە دەرەتانی دەستنیشانکردنی نییە، بە تایبەتی لەو ژنانەدا کە تان و پۆی مەمکیان پەستراوە و مەترسیی تووشبوون بە شێرپەنجەیان لە ئاستێکی بەرزدایە.
* بۆ ناسین و جیاکردنەوەی تان و پۆی تومۆر و جێگەی برین.
* دیاریکردنی شوێنگەی تومۆرگەلی جۆراوجۆر.

---

731 Dense
732 Nonfatty breasts
733 Recurrent

* بڕیاردان سەبارەت بەو شێرپەنجانە کە لە ڕێگەی کەڵکوەرگرتن لە ماموگرافی و سۆنۆگرافییەوە دیاری کراون و بۆ شوێنەکانی دیکەی تان و پۆی مەمک و دیواری ڕکەی سینگ تەشەنەیان کردووە.
* بڕیاردان سەبارەت بە ڕادەی بڵاوبوونەوەی شێرپەنجە پاش بیوپسی و بڕین و لابردنی لیمفەگرێکان.
* دیاریکردنی ڕادەی کاریگەریی شیمۆدەرمانی لە نەخۆشدا.
لە کاتی سینتی ماموگرافیدا کەڵک لە مادەگەلی ڕادیۆئەکتیڤی وەکو تکنسیۆم ۹۹m، ئیندیۆم -۱۱۱[734] و تالیوم – ۲۱۰[735] وەردەگیرێ. سینتی ماموگرافی وەکو شێوازێک بۆ دۆزینەوەی شێرپەنجەی مەمک لەبەرچاو نەگیراوە، بەڵام کاتێک ماموگرافی دژوار و ئاڵۆز بێ، یان یاریدەی دیاریکردنی تومۆر نەدا، هەروەها بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو نەخۆشانە کە لەژێر مەترسییەکی زۆردان، یان بۆ لێکدانەوەی ڕادەی کاردانەوەی تومۆر بە شیمۆدەرمانی، کەڵک لە سینتۆماموگرافی وەردەگیرێ.
لە تومۆگرافی بە ڕەوانەکردنی پۆزیترۆنەوە بە هۆی کەڵکوەرگرتن لە ڕیزێک لە متابۆلیتە نیشانەکراوەکان[736] (وەکو گلوکۆزی فلۆردار[737] [FDG ۱۸]) دەکرێ گۆڕانی میتابۆلیسمی لەش، ڕەگەکان، بەکارهێنانی ئۆکسیژێن و چۆنیتیی وەرگرەکانی تومۆر دیاری بکرێ.
٤. لێکۆڵینەوە لە ڕێگەی نەشتەرگەری و نموونەهەڵگرتنەوە (بیوپسی).
بیوپسی یەکێکە لە هەنگاوە پێویستەکان لە ڕەوتی دیاریکردنی شێرپەنجەی مەمکدا. بەپێی ئەوەی کە جاری شێوازێکی جێمتمانە بۆ جیاکردنەوەی تۆپەڵی نائاسایی زیانبەخش لە بێزیان نەدۆزراوەتەوە کە بتوانێ بەرابەری لەگەڵ وردبوونی تاقیکردنەوەی هیستۆلۆژیکی بکا، لە زۆربەی بوارەکاندا پێش بڕیاردان بۆ هەڵبژاردنی دەرمانی شیاو، پێویست بە تاقیکردنەوەی هیستۆلۆژیکی و سیتۆلۆژیکییە تا

734 Indium-111
735 Thallium-210
736 Labeled metabolites
737 Fluorinated glucose

پێش نەشــتەرگەری یان ڕادیۆتراپی یان شــیمۆدەرمانیی ســەرەتایی، شـێوازی دەرمان هەڵببژێرری. نموونەهەڵگرتن بە یاریدەی دەرزییەکی باریک[738] بۆ لێکۆڵینەوەی خانەناســییە و دەکری بە ئاســانی تۆپەڵی کیسـتێک لە نێوپڕ جیا بکرێتەوە. کاتێک تۆپەڵی نێو مەمک ڕەق بێ یان شـک و گومان لە دیاریکردنی شێرپەنجەدا هەبێ، دەکری بۆ بیوپسـی کەڵک لە دەرزییەکی خڕی لوولەیی[739] بە ئەســتووریی ١٤ یان ١٦ و درێژایی ١٥ هەتـا ٢٢ میلیمــەتر وەربگیری. جـاروبـار بۆ بڕین و جیـاکردنەوەی تۆپەڵ کەڵـک لە نەشـــتەرگەری وەردەگیری.[740] لەم حاڵەتەدا وێچوونی هەڵسەنگاندنی ئەندازەی ڕەهەندی تومۆر بە وردی و نیشانەکانی تان و پۆ هەیە.

## شیکردنەوە لە کاتی نەشتەرگەریدا

هەبوونی دەرفەت بۆ دیـاریکردنی خێرا لە کـاتی نەشـــتەرگەری، بە تایبەتی کۆنترۆڵی لێواری ڕێزەکسـیۆن و لیمفەگرێکانی پێشــەنگ، ئەم دەرفەتە بە نەشـــتەگەر دەدا تا لە کاتی نەشـــتەرگەریدا هەنگاوگەلی پێویست هەڵگری.

## بیوپسی لیمفەگرێکانی پێشەنگ

ســـینتیگرافی بۆ دیاریکردنی لیمفەگرێکانی پێشـــەنگ ٢ هەتا ٤ کاژێر پاش لێدانی ٤٥٠ میرکوریی کلۆیدی ســولفور تەکنیکۆم لە دەوروبەری ئاریۆلی ئەو مەمکەی کە تومۆری تێدا جێگیر بووە. دوای دیاریکردنی لیمفەگرێکانی پێشـــەنگ، باشـــترە نەخۆش بۆ دیوی نەشـــتەرگەری بگوازرێتەوە، مەودای نێوان لێدانی ســولفۆرتەکنیکۆم و نەشـتەرگەری لە ١٨ هەتا ٢٤ کاژێر زۆرتر نەبێ.

---

738 Fine needle biopsy
739 Core needle biopsy
740 Excision Biopsy

بۆ بیوپسی لیمفەگرێکانی پێشەنگ، پێویست بەم مەرجانە هەیە:

* ئەندازەی تومۆر هەتا ٢ سانتیمەتر بێ.

* بوونی حاڵەتی چەند ناوچەیی[٧٤١] و بە تایبەتی چەند ناوەندی ڕەت کرابێتەوە.

* لیمفەگرێکانی ئاکسیلار لە ڕوانگەی کلینیکی و وێنەییەوە حاڵەتی نائاساییان نەبێ.

* هەبوونی دەرفەت بۆ خێرادیاریکردنی حاڵەتی پاتۆلۆژیکی بەشێک لە تومۆری بەستووە لە کاتی نەشتەرگەریدا.

* هەبوونی شوێنی پزیشکی ئەتۆمی (گەردیلەیی) لە کاتی بەکارهێنانی شێوەی ڕادیۆنۆکلیۆیدی.

* شیکردنەوە و ڕازیبوونی نەخۆش بە ئەنجامدانی ئەم کارە.

## ڕێزەکسیۆنی ئاکسیلار

کاتێک ئیندیکاسیۆن بۆ بیوپسی لیمفەگرێکانی پێشەنگ نەبێ، پێویستە بۆ پلەبەندی و دەرمانی شیاوی تومۆر لایەنی کەم ١٠ لیمفەگرێ لە ئاستی ١ و ٢ی ناوچەی ئاکسیلار لە ڕێگەی نەشتەرگەرییەوە دوای بڕین جیا بکرێنەوە.

## چارەسەر

نەشتەرگەری وەکو دەرمانی سەرەکی بۆ قۆناخی سەرەتایی شێرپەنجەی مەمک لەبەرچاو دەگیرێ و بەشێکی زۆر لە نەخۆشەکان تەنها لە ڕێگەی نەشتەرگەرییەوە دەرمان دەکرێن. ئامانجی سەرەکیی نەشتەرگەری، ڕێزەکسیۆنی تەواوی تومۆری سەرەتاییە بۆ هێنانەخوارەوەی مەترسیی سەرهەڵدانەوەی شێرپەنجەی مەمک، هەروەها قۆناخبەندیی پاتۆلۆژیکی تومۆر و لیمفەگرێکانی بنهەنگڵ و پێشبینیی ماوەی خایاندنی ئەم نەخۆشییە.

---

[741] Multifocality

## ستراتیژیی نەشتەرگەر

بۆ باش بەڕێوەبردنی بەرنامەی داڕێژراوی نەشتەرگەری، پێویستە تا ئەو جێگەیەی دەکرێ، زیانی گەیشتوو[742] بەو ئەو ئەندامەی کە شیاوی نەشتەرگەرییە، بە وردی پۆلبەندی بکرێ. باشترین شێوە بۆ ئەم کارە بەکارهێنانی بیوپسی کونکەرە یان کەڵکوەرگرتنە لە دەرزی[743]. شوێنی زیانپێگەیشتوو یان ڕەنگە باشتر بێ بڵێین چەندناوەندبوونی[744]، ڕۆڵێکی گرینگی لە بڕیاردان لەسەر بەرنامەی نەشتەرگەری، بە تایبەتی لە کاتی بەکارهێنانی شێوەی ئۆنکۆپلاستیکدا (Fitzal et al, 2007) هەبێ. پێویستە کەڵک لە شێوە شیاوەکان بۆ دەرمانی ئەم نەخۆشییە وەربگیرێ.

## چەشنەکانی نەشتەرگەری

لێرەدا بوونی دەستەیەکی پسپۆڕ لە نەشتەرگەرانی ئۆنکۆلۆژی، پلاستیک و بە تایبەتی ئۆنکۆپلاستیک پێویستە. بەپێی چۆنێتی، ڕادەی هێرشبەری و شوێنی تومۆر، نەشتەرگەری پانتاییەک لە لومبێەکتۆمییەکی ساکار تا سازکردنەوەیەکی خێرا[745] لە خۆ دەگرێ. نەشتەرگەری لەم ساڵانەدا لە بڕین و لابردنی تەواوی مەمک (**ماستێەکتۆمی**) هەتا نەشتەرگەری بەبێ لابردنی تەواوی مەمک[746] گەشەی کردووە. لە پەنای دەرمانی خۆجێیی (لۆکاڵ)، ترایی سیستەمیک ڕۆڵێکی بەرچاو لە بەرنامەی دەرمانکردنی کارسینۆمی مەمکدا دەگێڕێ. چەشنەکانی نەشتەرگەری بریتین لە:

---

742 Lesion
743 Punch or needle biopsy
744 Multifocal or multicentricity
745 Immediate reconstruction
746 Breast conserving surgery

* **لامپئەکتۆمی**[٧٤٧] (ماســـتئەکتۆمی بەشـــێک یاخود ســـێگمانێک[٧٤٨]). ڕیزەکســـیۆنی تەواوی تومۆری ســـەرەتایی بە مەبەســـتی گەیشـــتن بە لێواری پەرەگرتووی نەرێنی[٧٤٩] (لە حاڵەتی تەواو دڵخوازدا ١ سانتیمەتر).

**کۆنترائیندیکاسیۆنە ڕێژەییەکان بۆ لامپئەکتۆمی بریتین لە:**

- چکۆلەبوونی مەمک.
- گەورەبوونی تومۆر (سەرەوەی ٥ سانتیمەتر).
- نەخۆشیی کۆلاژێن ڤاسکۆلار[٧٥٠].

**کۆنترائیندیکاسیۆنی ڕەها بۆ لامپئەکتۆمی بریتیین لە:**

- نەخۆشیی چەندناوەندی[٧٥١].
- بوونی پێشینەی ڕادیاسیۆنتراپی لەو ناوچەیەی کە دەرمان دەکرێ.
- کاتێک نەخۆش بە هۆی هەبوونی نەخۆشـــییەکی هێرشـــبەر توانایی تێپەڕکردنی ڕادیاسیۆنتراپیی نەبێ.
- سێ مانگی یەکەم یاخود دووەمی سکپڕی.
- بوونی لێواری ئەرێنیی سەقامگرتوو.

* **ماستئەکتۆمیی تەواو چەشنەکانی بریتین لە:**

- **ماســتئەکتۆمیی هاوتەرازی ڕادیکاڵ**[٧٥٢]: لەم حاڵەتەدا تەواوی تان و پۆی مەمک لەگەڵ لیمفەگرێکانی ئاکسیلار لادەبەن.
- **مـاســـــتئەکتۆمیی ڕادیکــاڵ**[٧٥٣]: لەم حــاڵەتەدا مەمــک و گەورە ماسوولکەکانی پێکتوراڵ[٧٥٤] لادەبەن.

---

747 Lumpectomy
748 Parital or segmental mastectomy
749 Widely negative margins
750 Collagen vascular disease
751 Mulifocadisease
752 Modified radical mastectomy
753 Radical mastectomy
754 Pectoralis major

- **ماسـتئەکتۆمیی ڕادیکاڵی پەرەدراو**[755]: لەم حاڵەتەدا لیمفەگری ژوورەکییەکانی مەمک[756] لادەبەن.
- **ماستئەکتۆمیی تەواو بە پاراستنی پێستەوە**[757].
- **ماستئەکتۆمیی تەواو بە پاراستنی گۆی مەمکەوە.**

* **ئاڵۆزییەکانی پاش ماستئەکتۆمیی تەواو بریتین لە:**
- مەترسیی سەرهەڵدانەوەی خۆجێیی (٥٪ هەتا ١٠٪).
- چڵککردنی برین.
- سێرۆما[758].
- نێکرۆزیس.
- هیماتۆما.
- ئێشی درێژخایەن.
- لیمفئیدیما[759].
- فیبرۆزیس.

* **کوادرانتئەکتۆمی**[760]: ئەم چەمکە لە لایەن ڤێرینۆسـییەوە دانراوە (Veronesi et al, 2002). لەم حاڵەتەدا چواریەکی تان و پۆی مەمک لەگەڵ ماسوولکەی دیواری سینگ بە بڕینێکی شێوەهێلکەیی لادەبرێ. لە کوادراتئەکتۆمیی سـەرووی دەرەکیدا دەکرێ تەواوی لیمفەگرێکانی بنهەنگڵ یان لیمفەگرێی پێشەنگ لە ڕێگەی بڕینەوە بە تەواوی لاببرێ. لە بەراوردکردنی لیمفئەکتۆمی لەگەڵ یان بەبێ تیشـکدەرمانی نیشـان دراوە، لەوانەی کە تیشـکدەرمانی نەکراون، وێچوونی سەرهەڵدانەوەی خۆجێیی شـێرپەنجە بە چەشـنێکی بەرچاو لە سـەرەوەیە. مەودای

[755] Extended radical mastectomy
[756] Internal mammary
[757] Skin-sparing mastectomy
[758] Seroma
[759] Lymphedema
[760] Quadrantectomy

لێواری ڕێزەکسیۆنەکە بەرچاوترین فاکتەری پرۆگنۆستیکە بۆ سەرهەڵدانەوەی خۆجێیی شێرپەنجە، واتە لێواری ڕێزەکسیۆن هەرچەند لە تومۆرەکە دوورتر بێ، ویچوونی سەرهەڵدانەوەی شێرپەنجە کەمترە.

## چارەسەری چەشنەکانی شێرپەنجەی مەمک

### پێشدەرمان[761]

**تراپیی یاریدەدەری نوێ.** ئەم چەشنە تراپییە کاریگەرییەکی باش و بەکەڵکی لەسەر بەشێک لە نەخۆشەکان هەیە. لە لێکۆڵینەوەکاندا جیاوازییەک لە ماوەی زیندوومانەوەی ئەوانەی کە پێش یان پاش نەشتەگەری بەم چەشنە دەرمان کراون، نەدیتراوە ( van der Hage et all, 2001). شیمۆدەرمانیی یاریدەدەری نوێ (ئانتراسیکلین – و تاکسان[762]) دەتوانێ لە ٢٥٪ی بوارەکاندا ببێتە هۆی چاکبوونەوەی یەکجاریی نەخۆش. لە کاتی ئێستادا، بە گشتی تراپیی یاریدەدەری نوێ بۆ ئەو کەسانە کە ئەندازەی تومۆریان بە لایەنی کەم تا ٣ سانتیمەتر یان شوێنی سەرهەڵدانی تومۆرەکەیان ناشیاوە، لەبەرچاو دەگیرێ.

### ا. دەرمانی شێرپەنجەی هێرشبەری مەمک

کاتێک ئەم چەشنە شێرپەنجەیە دیاری کرا، بڕین و دەرهێنانی تومۆر لە ڕێگەی نەشتەرگەرییەوە دەرمانی سەرەکییە لە قۆناخی سەرەتایی شێرپەنجەدا. قۆناخبەندیی بە یارمەتیی کامپیۆتێرتومۆگرافی و سکەنی ئێسکەکان بۆ دەستنیشانکردنی پەرەگرتوویی نەخۆشی و زۆرتر بۆ ئەو کەسانەیە کە:

* تومۆرەکەیان گەورەیە.

[761] Pre-treatment
[762] Taxane

* کاتی تێڕوانینی لەش لیمفەگرێکانیان دیاری دەکرێن.
* بە ڕوونی پەرەگرتوویی خۆجێیی و هەوەشـــێرپەنجەی مەمـک دەبینرێ.

بە شـــێوەیەکی مێژوویی، دەرمـانی ســـتـانـدارد بریتی بووە لە ماستئەکتۆمیی هاوتەرازی ڕادیکاڵ (لابردنی تەواوی تان و پۆی مەمک و لیمفەگرێکانی ئەو لایەی کە تووشـــی شــێرپەنجە بووە)، بەڵام لەم کاتەدا دەرمانی سـتاندارد بریتییە لە ماسـتئەکتۆمی و هەڵسـەنگاندنی لیمفەگرێکانی پێشـەنگ یان لامپێکتۆمی و هەڵسەنگاندنی لیمفەگرێکانی پێشـــەنگ بە شـــوێن ڕادیاســـیۆنتراپیی تەواوی مەمکدا. لە زۆربەی نەخۆشـەکاندا پاش ماسـتئەکتۆمی بۆ تەواوکردنی لۆکاڵتراپی، پێویست بە ڕادیاســـیۆنتراپی ناکا، بەو حاڵەش، لەوە دەچێ ڕادیاســـیۆنتراپیی دیواری ســـینگ و لیمفەگرێکانی دەوروبەر لە حاڵەتەکانی خوارەوەدا بەکار ببرێ:

* هەبوونی لێواری ئەرێنیی نەشتەرگەری، سەرەڕای ماستئەکتۆمی.
* هەوەشێرپەنجەی مەمک.
* گەورەتومۆر (سەرەوەی ٥ سانتیمەتر).
* هەبوونی چوار یان زۆرتری لیمفەگرێ ئەرێنییە ئاکسیلارەکان.

ڕادیـاســـیۆنتراپی پـاش مـاســـتئەکتۆمی نەک تەنهـا دەبێتە هۆی بـاشـــتربوونی کۆنترۆڵی خۆجێیی، هەروەهـا لەوە دەچێ ببێتە هۆی باشـترکردنی ماوەی ژیانی نەخۆش بە مەترسـیی سـەرەوە. سـەبارەت بە ڕادیاسـیۆنتراپی لەو نەخۆشـانەی کە لە یەک هەتا سـێ لیمفەگرێی ئەرێنییان هەیە، ناکۆکی و جیاوازیی بیروبۆچوون هەیە.

### II.دەرمانی کارسینوم لە جێدا[٧٦٣]

- **کارســـینۆمی بۆری لە جێدا** زۆرتر لە کـاتی مـامۆگرافیدا دیـاری دەکرێ، بەڵام لەوە دەچێ لە کەســـانێکدا وەکو تۆپەڵێکی نائاســـایی لە

[763]Ductal carcinoma in situ

کاتی دەستلێداندا هەستی پێ بکرێ. دەرمانی خۆجێیی بریتییە لە دەرمان بە ڕاگرتن یان پاراستنی مەمک (لامپێکتۆمی لەگەڵ ڕادیاسیۆنتراپی) یان ماستێکتۆمی.

ڕادیاسیۆنی یاریدەدەر یان هۆرمۆندەرمانی زۆرتر بۆ ژنە گەنجەکان و ئەو نەخۆشانەی کە لامپێکتۆمی کراون، لەبەرچاو دەگیرێ. بە هۆی شکڵی تایبەتمەندی بیۆلۆژیکیی بۆرییەکانەوە، وێچوونی سەرهەڵدانی حاڵەتی چەندناوەندی[٧٦٤] لەواندا بەرزترە. لەم حاڵەتەدا بە هۆی چەندناوەندبوون و نەبوونی دەرفەتی ڕێژەکسیۆن، نەشتەرگەری کۆنترائیندیکاسیۆنی هەیە. لە کارسینۆمی بۆری لە جێدا تامۆکسیفین[٧٦٥] تەنها دەرمانێکە کە بۆ یاریدەدەرمانی لە حاڵەتی کارسینۆمی بۆری لە جێدا بە ئەرێنیبوونی وەرگرەکانی هۆرمۆنی ئیسترۆژین کەڵکی لێ وەردەگیرێ. بەکارهێنانی تامۆکسیفین بۆ ٥ ساڵ وێچوونی مەترسیی سەرهەڵدانەوەی شێرپەنجە و پەرەسەندنی شێرپەنجەی تازەی سەرەتایی مەمک لە مەمکەکەی دیکە کەم دەکاتەوە.

- **لە کارسینۆمی لۆبوولار لە جێدا** بە گشتی دەرمانی هەڵبژاردە بریتییە لە چاودێریی بەردەوام لەگەڵ یان بەبێ بەکارهێنانی تامۆکسیفین و ماستێکتۆمیی دووولایەنە لەگەڵ یان بەبێ سازکردنەوەی مەمک. لەم کەسانەدا بەڵگەیەک بۆ بەقازانجبوونی بڕین و دەرهێنانی خۆجێیی، دیسێکسیۆنی ئاکسیلار، ڕادیۆ یان شیمۆدەرمانی نییە. ئەو ژنانەی کە تووشی شێرپەنجەی بۆری یان لۆبوولار بوون، پێویستیان بە نەشتەرگەریی خێرای مەمکەکەی دیکەیان (بەرامبەر) نییە.

---

[٧٦٤] کاتێک پتر لە دوو ناوەندی سەربەخۆ لەیەک لە دەرەوەی کوادرانتێکدا ببینرێ، باس لە چەمکی چەندناوەندی دەکرێ. لەم حاڵەتەدا بە هۆی جوانکاری و ئۆنکۆلۆژیک دەرفەتی نەشتەرگەری نییە.

[765] Tamoxifen

## III. دەرمـانـی شـــێـرپەنـجەی پەرەگـرتـووی خـۆجـێـیـی و هەوەشێرپەنجەی مەمک

لەم دوو حاڵەتەدا پێش دەســـتپێکی دەرمانی خۆجێیی، پێویســـت بە تراپییەکی ســیســتەمیکە. لەو نەخۆشــانەدا کە تووشــی شــێرپەنجەی پەرەگرتووی خۆجێیی بوون، بە گشـــتی تومۆرەکەیان گەورەیە و بۆ نەشتەرگەری نابێ، هەروەها پێست و دیواری سینگیشیان (T4)، یان لیمفەگرێکانیان بە چەشــنێکی پەرەگرتوو تووشــی تومۆر بووە، پێش نەشــتەرگەری پێویســت بە شــیمۆدەرمانییە. ئامانجی شــیمۆدەرمانی پێش نەشـــتەرگەری چکۆلەکردنەوەی ئەندازەی تومۆر و پێکهێنـانی دەرفەتی پێویســـتـە بۆ نەشـــتەرگەری. لە کـاتی بوونی دەرفەت بۆ نەشـــتەرگەریدا، تومۆری T3 زۆر جار بۆ بردنەســـەرەوەی ڕادەی پاراســـتنی مەمک و قازانجی گشـــتی، پێویســـت بە هۆرمۆن یان شیمۆتراپیی پێش نەشتەرگەرییە. پرۆگنۆزی هەوەشێرپەنجەی مەمک باش نییە، بەڵام ٣٠٪ی نەخۆشـــەکان وێچوونی دەرمانکردن بە هۆی کەڵکوەرگرتن لە کۆدەرمـانی (تێکەڵاودەرمـانی)[٧٦٦]ی شـــیـاو لەگەڵ شیمۆدەرمانیی سیستەمیک، ماستئەکتۆمی و ڕادیاسیۆنتراپی بەرزە.

## IV. نەشتەرگەریی تومۆرە ناوەندییەکان

**کـارســـینۆمەکـانی ڕەترۆمـامیلار**[٧٦٧] لە ڕێگـەی نەشـــتەرگەریی ئۆنکۆپلاســـتیک و بەبێ بڕین و دەرهێنانی مەمک، دەرمان دەکرێن و لەم حاڵەتەدا پێویســت بە ماســتئەکتۆمی ناکا. ڕێزەکســیۆنی ســادەی ناوەندی، ڕێزەکسیۆنی سادەی ئاریۆلا[٧٦٨] و بڕین و دەرهێنانی گشتیی تومۆرەکە، هاســانترین مێتۆدە بۆ ڕێزەکســیۆنی تومۆرە چکۆلەکان. لە ڕێگەی بڕینی شـــێوەهێلکەیی ئاریۆلا و تومۆری ژێرەوەی، وێچوونی

---

[766] Multimodality treatment
[767] Retromamillar carcinoma
[768] Areola

برین و دەرهێنانی گەورەتومۆر بەبێ دەرهێنانی مەمک هەیە. بێجگە لە شـــێوەکانی ســـەرەوە، کەڵک لە دوو چەشـــنی ڕیزەکســـیۆنی هاوتەرازکەر[769] و ڕیزەکسیۆنی پلاستیک[770] وەردەگیرێ.

## 7.شێرپەنجەی تەشەنەکردووی مەمک[771]

شێرپەنجەی تەشەنەکردووی مەمک بە گشتی نەخۆشییەکی بێدەرمانە و مـامنـاوەنـدی ژیـانی ئەم کەســـانە تـا ٢ ســـاڵە، بەڵام بە هۆی باشـــتربوونی ئاســـتی تراپیی یاریدەدەر و ســـیســـتەمیک، ڕادەی زینـدوومـانەوەی نەخۆشـــەکان بەرز بووەتەوە. ئامـانجی تراپیی ئەم نەخۆشـــانە بریتییە لە باشـــترکردنی ئاکامی کلینیکی و چۆنێتیی ژیانی نەخۆش. ئەو ژنانەی تووشـــی شـــێرپەنجەی تەشـــەنەکردووی مەمک بوون، نەشـــتەرگەری یان ڕادیاســـیۆنتراپی ناکرێن و لەوە دەچێ نەشتەرگەریی خۆجێیی و ڕادیاسیۆنتراپی لە کەسانێکدا تەنها شێوەی کارا بێ بۆ کەمکردنەوەی ئازار و نیشـانەکانی نەخۆشـــی و دەرمانی گوشـــاری ســـەر مۆخی بڕبڕە. هۆرمۆن و شـــیمۆدەرمانی بنەمای سەرەکیی دەرمان پێک دەهێنن. لەو نەخۆشانەدا کە تووشی نەخۆشیی تەشـەنەکردووی ئێسک[772] بوون، لێدانی مانگانەی بیسفۆسفۆنات[773] لە ڕێگەی خوێنهێنەرەوە پێشـگیری لە تەشـەنەکردنی زیاتر بۆ ئێسـک و شکانی ئێسکەکان دەکا.

---

769 Modified
770 Plastic Resection
771 Metastatic Breast Cancer
772 Metastatic bone disease
773 Bisphosphonate

## چەشنی تایبەتیی شێرپەنجەی مەمک

### شێرپەنجەی مەمکی پیاوان

هۆ، دیاریکردن و دەرمانی شـێرپەنجەی مەمک لە پیاواندا وەکو ژنانە. بە پێچەوانەی ژنـان، ئەم چەشـــنە شـــێرپەنجەیە لە پیـاوانـدا کەمتر ســـەرهەڵـدەدا، بەڵام ســـەرەڕای ئەوەش، لەم دواییـانەدا ڕادەی شـێرپەنجەی مەمکی پیاوان، بە تایبەتی لە ئەمەریکا، کەنەدا و بریتانیا چووەتە ســـەرێ. شـــێرپەنجەی مەمک ١,٥٪ی تەواوی شـــێرپەنجەی پیـاوان و نزیکە ١٪ی تەواوی شـــێرپەنجەکانی مەمک لە خۆ دەگرێ. لەوانەی تووشـــی سـێندرۆمی کلاینفیلتیر بوون، شـێرپەنجەی مەمک حاڵەتێکی میراتییە و مەترسیی سـەرهەڵدانی لەم کەسانەدا بە بەراورد لەگەڵ خەڵکی ئاسایی کۆمەڵگەکە تا ٥٠ قات بەرز دەبێتەوە.

# سەرچاوەکان

1- M. Kieichle, N. Harbech, und V. Heinemann Die Onkologie, 2. Auflage, Teil 2 , Mammakarzinom, , Seite 952-989, Springer, 2010
2- Alison T Stopeck, MD؛ Chief Editor: Jules E Harris, MD more…Breast Cancer, Updated: Sep 16, 2014http://emedicine.medscape.com/article/1947145-overview#showall
3- Hyman B. Muss, Breast Cancer and Differential Diagnosis of Benign Lesion, Cecil Medicine 23rd edition, Goldman. Austiello, Saunders Elsevier, 2008, Page 1501-1510
4- Dr. Roger A. Dashner Clinical Anatomist. Clinical Anatomy of the Breast, http://www.oucom.ohiou.edu/dbms-witmer/downloads/2012-04-24_dashner_rpac-breastanatomy.pdf
5- Joseph A Sparano, MD؛ Chief Editor: Jules E Harris, MD more…Breast Cancer Staging, Updated: Sep 6, 2013, http://emedicine.medscape.com/article/2007112-overview
6- .Thomas E, Andreoli/ Ivor J. Benjamin &Andreoli and Carpenter's CECIL Essentials of Medicine, 8th Edition 2010, …
7- .Steven Perlmutter, MD, FACR؛ Chief Editor: Eugene C Lin, MD more…Ultrasonography in Breast Cancer Updated: Dec 4, 2014 http://emedicine.medscape.com/article/346725-overview
8- Anderson l, hojris l, Erlanksen j (2000) Treatment of breast cancer related lyphmedema with a without manual lymphatic drainage-a randomized study ,Asta Oncology 39: 955-96
9- Barton SR, smith IE,, Kirby AM, Ashley S,Walsh g, Parton M, The role of ipsilateral breast radiotherapy in management of occult primary breast cancer presenting as axillary 231dvanced231a231athy. Eur J Cancer.2011؛47(14):2099-106
10- Ben Hassouna J: am J Surg. 2006 Aug,192 (2):141-7
11- Blichert –toft, M Rose C, Andersen JA, Overgaard M,Axelsson CK,Andersen, KW Moueiidsen HAT (1992) Danish randomized trial comparing breast conservation therapy with mastectomy: six years of life-table analysis.
12- .Boris M., Weindorf S, Lasiinski B (1997) persistence of 231dvanced231a reduction after noninvasive complex lymph edema therapy oncology 11: 99-109

13- Caliskan M.et al. 2008 Paget diseas of the breast : exoirience of the europ. Inst. Of Oncol and reviw of the Literature: Breast can.Res.Treat. 112: 513-521
14- Chia S et al. Locally 232dvanced an inflammatory breast cancer J Clin Oncol 2008 ؛26:786-790
15- Belkacemi y , et al. Phylloides. Tumor.Of the breast (2007): Int. Radiat. Oncol. Biol. Phys.
16- Chen WH: j Surg Oncol2005 Sep 1 ؛ 91(3):94-184
17- Danish Breast cancer Cooperative Group.Natl J. Cance r Inst Monogr 11: 19-25
18- Dawood S, Merajver SD, Viiens P, Vermeulen PB, Swain SM, Buchholz TA, dirix LY, Levine PH, Lucci A, krishnamurty S, Robertson FM, Woodward WA, Yang WR, Ueno NT, Cristofanili M, International expert panel on inflammatory breast cancer.consensus statement for standardited diagnosis and treatment.Ann Oncol 2011؛22(3):515-23.
19- EBCTCG Radiotherapy for early breast cancer (2002) Cochrane database Syst REVCD003647.
20- Fischer B, Anderson S, Bryant J, Margolse RG, Deutsch m, fisher ER, Jeong HR, Wolmark N (2002)Twenty year follow up of a randomized trial comparing total mastectomy ,lumpectomy , and lumpectomy plus Irradiation N Engle J Med 347: 1233-1241
21- Granic M: Acta Chir Iugosl. 2006؛ 53(1):57
22- Hordt KC ,smitt MC, Goffnet DR. Carlson RW (2005) Predictors of local recurrence after breast –conservation therapy.Clin. Breast Cancer 5: 425-438
23- Ko EY : Breast MRI for evaluating patents with metastatic axillary lymph node and initially negative mammography and sonography. Korean j Radal.2007 Sep-Oct؛8(5):382-9
24- Leidenius MH, Krogerus LA et al. (2006) the clinical value of parasternal sentinel node biopsy in breast cancer.ann. Surg Oncol 13: 321-326
25- Pentheroudakis g et al. axillary node metastasesfrom carcinomaof unknown primary (CUPax):a systematic review of published evidence.Breast cancer res Treat 2010؛119:1-11
26- Penzer et al.Malig.Phy.tu. Of the breast: Local control rates with surgery alone 2008:Int.J Radiat.Oncol. Biol.Phys
27- Moon JY, et al. Malgnant invatiion of the nipple –areolar complex of the breast: usefulness of breastnMRI.. Am J Roentgenol. 2013 May 1؛ 97(9):2142-9

28- Morales-Vasques F. Adjuvant chemotherapy with doxorubicin and dacarbacine has no effect n recurrens –free survival of malignant phyllodes tumors of the breast. Breast J 2007 Nov-Dec : 13(6)..551-6
29- Morrow M Breast cancer in young women: Treatment. (2005) j Cline Oncol ASCO 41:46
30- Salama JK, Heimann R et al. (2005) Does the number of lymph nodes examined in patients with lymph node negative breast carcinoma have prognostic significance ? Cancer 103: 664-671
31- S.Johnston 2008 J. Clin. Oncol. 26: 1066-1072
32- Soumarowva R: arch Gyneco Obstest. 2004 May 269(4):268-81
33- Spitaleri G, et al. Breast phxllodes tumor: a review of literature and a single center retrospective series analysis. Crit Rev Oncol Hematol.2013 : 88:427-36
34- Sousa B et al.An update on male breast cancer and future directions for research and treatment.Eur J Pharmacol 2013 : 717 (1-3)
35- Tan EY: ANZ J Surg.2006 Jun : 76(6):476-80
36- Tsai CJ et al. Outcomes after multidisciplinary treatment of inflammatory breast cancer in the era of neoadjuvant HER2-directet therapy. Am J Clin Oncol 2013 (Epub ahead of print)
37- Veronosi u, Luini A,Del Vecchio M, Greco M, Saccozzi R, Luini A, Aguilar M, Marubini E (2002) Twenty year follow up of a randomized study comparing breast conserving surgery with radical mastectomy for early breast cancer.N. Engl j med.328: 1587-1591
38- http://www.bcancer.ir/Images/News/AtachFile/11-8-1390/FILE634558237068140000.pdf
39- Richard S. Eisenstaedt, MD, FACP : Profesor of Medicine &..... MKSAP 16, Hematology and Oncology 2015, ACP, USA
40- www.brustambulanz.info
41- www.abcsg.at
42- /www.aco-asso.at
43- www.u.arizona.edu/-witte/ISL.htm

## بەشی یازدەهەم

## شێرپەنجەی پرۆستات[774]

### پەتاناسی

شێرپەنجەی پرۆستات دووەمین شێرپەنجەی باوی پیاوانە لە ئاستی جیهاندا. جیاوازیی سەرهەڵدانی ئەم شێرپەنجەیە لە جیهاندا سەرەوەی ٥٠ جارە، بەرزترین ڕادەی سەرهەڵدانی ئەم نەخۆشییە لە باکووری ئەمەریکا، ئوسترالیا و باکوور و ناوەندی ئورووپایە و کەمترینی لە باشووری ڕۆژهەڵات و باشوور- ناوەندی ئاسیا و باکووری ئەفریقایە. لە ئەمەریکا هەر ساڵ شێرپەنجەی پرۆستات لە نزیکەی ١٩٠٠٠٠ کەسدا دیاری دەکرێ و ٢٧٠٠٠ کەس بەم هۆیەوە گیانی خۆیان لە دەست دەدەن. لە ئەڵمانیا هەر ساڵ نزیکەی ٥٨٠٠٠ پیاو تووشی شێرپەنجەی پرۆستات دەبن و ١٢٠٠٠ کەس بەم هۆیەوە دەمرن. ڕادەی سەرهەڵدانی ئەم شێرپەنجەیە لە نێوان ڕەشپێستەکان بە بەراورد لەگەڵ سپیپێستەکان و سپانیاییەکان بەرزترە. شێرپەنجەی پرۆستات لە پیاوانی ئاسیایی ئەمەریکادا بە دەگمەن دەبینرێ.

---

774 Prostate Cancer

لێکۆڵینەوە جیهانییەکان لە پێوەندی لەگەڵ سەرهەڵدانی شێرپەنجەی پرۆستاتدا لە نێوان تەمەنی ٦٠ و ٧٠ساڵیدا جیاوازییەک پیشان دەدات: ٧٠ لە هەر ١٠٠٠٠٠ کەس (لە پیاوانی ئەمەریکایی) و ١٤ لە هەر ١٠٠٠٠٠ کەس (لە پیاوانی یونانی)دا.

## هۆ و فاکتەرە مەترسیدارەکان

هۆی سەرهەڵدانی شێرپەنجەی پرۆستات جارێ بە تەواوی ڕوون نەبووەتەوە، بەڵام لەوە دەچێ ئەم فاکتەرانە ڕۆڵێکی گرینگیان لە ڕەوتی سەرهەڵدانی ئەم شێرپەنجەیەدا هەبێ:

**تەمەن:** بەپێی لێکۆڵینەوەکانی "تۆمارکردنی هاوبەشی شێرپەنجە"[٧٧٥]، ڕادەی سەرهەڵدانی شێرپەنجەی پرۆستات لە تەمەنی نێوان ٣٠ هەتا ٣٤ ساڵدا یەک لە هەر ١٠٠٠٠٠ کەسە، بەڵام ئەم ڕادەیە لە تەمەنی نێوان ٦٥ هەتا ٦٩ ساڵی دەگاتە ٥٨ لە هەر ١٠٠٠٠٠ کەس. بەپێی ڕاگەیاندنی بانکی زانیاریی ئەنستیتووی نەتەوەیی شێرپەنجەی ئەمەریکا (SEER) ڕادەی سەرهەڵدانی ئەم شێرپەنجەیە لە نێوان تەمەنی ٣٠ هەتا ٣٤ ساڵ نزیک بە "سفر"ە، بەڵام لە نێوان تەمەنی ٣٥ هەتا ٣٩ ساڵی ٠،٧ لە هەر ١٠٠٠٠٠ پیاودایە و ئەم ڕادەیە لە تەمەنی نێوان ٦٥ هەتا ٦٩ ساڵ دەگاتە ٩٠٥ لە هەر ١٠٠٠٠٠ پیاو. فاکتەرێکی دیکە کە مەترسیی سەرهەڵدانی شێرپەنجە بەرز دەکاتەوە، **ئامادەیی (هۆگری) بنەماڵەییە**[٧٧٦]. لەو پیاوانەدا کە لە ئەندامانی بنەماڵەیاندا شێرپەنجەی پرۆستات دیتراوە، وێچوونی سەرهەڵدانی ئەم شێرپەنجەیە بەرزترە و لەوە دەچێ ٦ هەتا ٧ ساڵ زووتر تووشی شێرپەنجەی پرۆستات بن. بەشێک لە لێکۆڵینەوەکان نیشاندەری مەترسیی بنەماڵەیی هاوبەش (زگماکی یان ژینگەیی)ە بۆ شێرپەنجەی پرۆستات و مەمک. موتاسیۆنی (BRCA-2)[٧٧٧] مەترسیی سەرهەڵدانی

---

[775] Common Cancer Registry
[776] Familial predisposition
[777] Breast Cancer 2

شێرپەنجەی پرۆستات بە چەشنێکی زۆر هێرشکەرانە و لە تەمەنی خوارێدا بەرز دەکاتەوە. بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی دیکەش موتاسیۆنی (HOXB13)[٧٧٨] فاکتەرێکی مەترسیدارە بۆ سەرهەڵدانی شێرپەنجەی پرۆستات. هەروەها جیاوازیی سەرهەڵدانی شێرپەنجەی پرۆستات لە نێوان خەڵکی گۆی زەوی لەوە دەچێ پێوەندی بە **فاکتەری ژنێتیکەوە** هەبێ. بۆ وێنە، وێچوونی سەرهەڵدانی ئەم شێرپەنجەیە لە پیاوانی بە ڕەچەڵەک خەڵکی باشووری بیابانی ئەفریقا بەرزترە، بەڵام ئەم ڕادەیە لە پیاوانی ئاسیاییدا لە ئاستێکی نزمتردایە. ڕەنگ **بێ چوونەسەرەوەی هۆرمۆنی پیاوانە** (تێستۆستێرۆن و مێتابۆلیتەکانی)، یەکێک لە هۆکارەکانی شێرپەنجەی پرۆستات بێ. بەپێی لێکۆڵینەوەکان، **خواردەمەنیی پڕچەوری و کەم فیبەر**[٧٧٩] مەترسیی سەرهەڵدانی ئەم شێرپەنجەیە بەرز دەکاتەوە. لەو پیاوانەدا کە تووشی **هەوی پرۆستات**[٧٨٠] بوون، تا ڕادەیەکی کەم مەترسیی سەرهەڵدانی شێرپەنجەی پرۆستات دەچێتە سەرێ. بە پێچەوانەی ڕاگەیەنراوەکانی ڕابوردوو، **وازێکتۆمی**[٧٨١] ڕۆڵێکی لە سەرهەڵدانی شێرپەنجەی پرۆستاتدا نییە.

## قەوارە و کاری پرۆستات

**پرۆستات** ڕژێنێکی دەرەوەڕێژە[٧٨٢] لە شێوەی گوێز و قورسییەکەی ١٠ تا ٢٥ گرامە. ئەو ڕژێنە سێ سانتیمەتر درێژ و ٤ سانتیمەتریش پانە، دوو سانتیمەتر و نیویش ئەستوورییەکەیەتی. پرۆستات لە ژێر میزەڵدان و لە پێشەوەی کۆم جێگیر بووە و پێکهاتەی ٣٠ تا ٥٠ ئاسینوسە[٧٨٣] (کیسە بچووکەکانی نێو ڕژێن). پرۆستات لە دێزەڵە

---

[778] Homeobox B13
[779] High- fat and low – fiber diet
[780] Prostatitis
[781] Vasectomy
[782] Exocrine organ
[783] Asinus




(کاسەی سمت)دا جێگیر بووە و لە لایەن ڕەکتۆم، میزەڵدان، کۆی خوێنهێنەرەکانی پەریپرۆستاتیک و دۆرساڵ[٧٨٤] (کاریان لە پێوەندی لەگەڵ فونکسیۆنی ڕەپبوون[٧٨٥]ی ئەندامی جنسیی پیاوە) و سفینکتەری میزەڕێ[٧٨٦] (کاری لە پێوەندی لەگەڵ کۆنترۆڵی پاسیڤی میزکردنە) دەوری گیراوە. لە پیاوە جحێڵەکاندا چوار ناوچە لە پرۆستات جیا دەکرێتەوە: پەراوێزی[٧٨٧]، ناوەندی[٧٨٨]، تێپەڕی[٧٨٩] و ستڕۆمای (بنچینەیی) فیبرۆماسکولاری پێشەوە[٧٩٠]. ناوچەی پەراوێزی بەشی سەرەکیی ڕژێنێکی ئاسایی پێک دەهێنێ. ئەم بەشە لە پشتەوە بەرامبەر بە ڕەکتۆمە و لە کاتی تێڕوانینی پرۆستاتدا بە قامک هەستی پێ دەکرێ (یان بەر قامک دەکەوێ). ناوچەی ناوەندیی دەوری بۆریی دەرهاوێژ (دەرپەڕێنەر)[٧٩١] دەگرێ. ستڕۆمای (بنچینەیی)

---

[784]Periprostatic and dorsal vein complexes
[785] Erectile functtion
[786]Urinary sphinter
[787] Peripheral zone
[788]Central zone
[789]Transitional zone
[790] Anterior fibro-mascular stroma
[791]Ejaculatory ducts

فیبرۆماسـکۆلاری پێشـەوە بەندی (بەسـتی)[792] پێشـووی تان و پۆی فیبروماسـکولاری هاوتەنیشـتە بە ماسـوولکەی سـافی میزەڵدان و سـفینکتەری دەرەکی[793]. ناوچەی تێپەڕی دەوری بۆریی میزبەر[794] دەگرێ و لە کاتی سـەرهەڵدانی تومۆری ناشـێرپەنجەیی (هیپێرپلازیی بێوەیی پرۆستات[795]) گەورە دەبێ و بەشی سەرەکیی پرۆستات پێک دەهێنێ. لە ڕێگەی خوێنبەری میزەڵدانی خواروو[796] کە لە خوێنبەری کلۆتی ناوەکی[797] سەرچاوە دەگرێ، خوێن دەگاتە میزەڵدان و پرۆستات. ئەم ئەندامە لە دوایین قۆناغی پێوەندیی سێکسیدا ٢٥٪ تا ٣٥٪ی سپێرم پێک دێنێ.

## پاتۆلۆژی

پەرەسـەندنی شـێرپەنجەی پرۆسـتات لە پێوەندی لەگەڵ تێکچوونی هاوسەنگیی ڕەوتی دابەشبوونی خانەکان[798] لەگەڵ مردنی خانەکانە[799] کە دەبێتە هۆی گەورەبوونی کۆنترۆڵنەکراوی تومۆر. پاش ڕوودانی ترانسفۆرماسیۆنی سـەرەتایی، موتاسـیۆنی زۆربەی ژینەکان، یەک لەوان ژینەکانی p53 و ڕەتینۆبلاسـتۆما[800] دەبنە هۆی پەرەگرتن و تەشـەنەکردنی تومۆر. سـەرەوەی ٩٥٪ی شـێرپەنجەی پرۆسـتات لە چەشنی ئادنۆکارسینۆم و لە ١٪ی لە چەشنی خانە پوولەکەدارەکان و باقییەکەی لە چەشـنی تومۆری خانەکانی تێپەڕی[801] و بە دەگمەن کارسینۆسارکۆمن[802]. لە زۆربەی بوارەکاندا شێرپەنجەی پرۆستات

---

[792]Band
[793] External sphincter
[794]Urethral
[795] Benign prostatic hyperplasia
[796] Inferior vesical artery
[797] Internal iliac artery
[798]Cell division
[799]Cell death
[800]Retinoblastoma
[801]Transitional cell tumors
[802] Carcinosarcoma

به جیاکردنەوەی پوولەکەیی[٨٠٣] پاش ڕادیاسیۆن یان هۆرمۆنتراپی سەرهەڵدەدا. لە ٧٠٪ی بوارەکاندا شێرپەنجەی پرۆستات لە بەشی پەراوێزی، لە ١٥٪ هەتا ٢٠٪ی لە بەشی ناوەندی و ١٠٪ هەتا ١٥٪ی لە ناوچەی تێپەڕی پرۆستات سەرهەڵدەدا. زۆربەی شێرپەنجەکانی پرۆستات لە چەشنی فرەناوەندین[٨٠٤]. تەشەنەی شێرپەنجە لە ئەندامەکانی دیکەوە بۆ پرۆستات بە دەگمەن ڕوو دەدا، بەڵام جاروبار وێدەچێ شێرپەنجەی ڕیخۆڵەگەورە و تومۆری خانەکانی تێپەڕی میزەڵدان بە چەشنێکی ڕاستەوخۆ تەشەنە بۆ پرۆستات بکەن.



نائاسایی بوونی ڕژێنەکان لە شێرپەنجەی ئاسیناریی پرۆستات

[803]Squamous differentiation
[804]Multifocal

## پۆلبەندیی TNMی شێرپەنجەی پرۆستات

### T – تومۆری سەرەتایی

**TX** تومۆری سەرەتایی بۆ هەڵسەنگاندن نابێ.

**T0** تومۆری سەرەتایی دیاری ناکرێ.

**T1** تومۆری پرۆسـتـات لە کاتی تێڕوانینی ڕەکتاڵ بە قامک یان وێنەگرتندا دیاری ناکرێ.

**T1a** دۆزینەوەی بەهەڵکەوتی هیسـتۆلۆژیکی تومۆر لە بەرامبەر یان کەمتر (≤) لە ٥٪ی تان و پۆی جیاکراوەی پرۆستات.

**T1b** دۆزینەوەی بە هەڵکەوتی هیسـتۆلۆژیکی تومۆر لە سـەرەوەی ٥٪ی تان و پۆی جیاکراوەی پرۆستات.

T1c تومۆر لە ڕێگەی بیوپسـی پرۆسـتات کە بە هۆی بەرزبوونی ئاسـتی دژەلەشـی تایبەتمەندی پرۆسـتات[٨٠٥] لە خوێندا کراوە، دیاری دەکرێ.

**T2** تومۆر لە چوارچێوەی پرۆستاتدا قەتیس ماوەتەوە، تومۆرەکان لە یەک یان هەر دوو لۆبی پرۆسـتات لە کاتی بیوپسـیدا دیاری دەکرێن، بەڵام لە کاتی تێڕوانینی پرۆسـتات لە ڕێگەی ڕەکتۆم بە قامک یان وێنەگری دەستنیشان ناکرێ.

T2a پەرسەسەندنی تومۆر بۆ نێو نیوەی یان کەمتر لە نیوەی لۆبێک.

T2b پەرەسـەندنی تومۆر بۆ نێو پتر لە نیوەی تەنها یەکێک لە لۆبەکان.

T2c پەرەسەندنی تومۆر بۆ نێو هەردوو لۆبەکان.

T3 پەرەسـەندنی تومۆر بۆ نێو کەپسـوولی پرۆسـتات[٨٠٦]؛ دزەکردنی نێو لوتکەی[٨٠٧] پرۆستات، یان کەپسـولی پرۆسـتات کە نەک وەک T3 بەڵکو وەکو T2 ڕیزبەندی کراوە.

---

[805] Prostate Specific Antigen

[806] Prostatic capsule

[807] Apex

T3a پەرەســەندنی تومۆر بۆ دەرەوەی کەپســوڵ دەبینرێ (یەکلایەنە یاخود دوولایەنە).

T3b پەرەسەندنی تومۆر بۆ نێو کیسەی تۆوی (تۆواوی).

T4 تومۆر جێگیر یاخود دزەکردنی بۆ نێو پێکهاتەکانی هاوتەنیشـــت بێجگە لە کیســـەی تۆویی (وەکو میزەڵدان، ماســـوولکەی بەرزکەرەوە (هەڵێنەر)[808]، لەگەڵ و/ یان دیواری دیزەڵە[809]).

## پاتۆلۆژی *(pT)

**pT2**. بەستراوە بە ئەندامەکەوە.

**pT2a** یەکلایەنە، پەرەســـــەندنی تومۆر بۆ نیوە یان کەمتر لە نیوەی یەکێک لە لۆبەکانی پرۆستات دەبینرێ.

**pT2b** یەکلایەنە، پەرەسەندنی تومۆر بۆ پتر لە نیوەی تەنها یەکێک لە لۆبەکانی پرۆستات.

**pT2c** نەخۆشیی دوولایەنە.

**pT3** پەرەسەندنی تومۆر بۆ دەرەوەی پرۆستات دەبینرێ.

**pT3a** پەرەســەندنی شێرپەنجەی پرۆســتات بۆ ئەندامەکانی دیکە یان هێرشکردنی میکرۆسکۆپیکی[810] بۆ نێو ملی میزەڵدان[811] دەبینرێ.

**pT3b** پەرەسەندنی تومۆر بۆ نێو کیسەی تۆوی دەبینرێ.

PT4 پەرەسەندنی تومۆر بۆ نێو میزەڵدان و ڕەکتۆم دەبینرێ.

* لێواری ئەرێنیی نەشـــتەرگەری پێویســـتە بە یاریدەی پێداهەڵگر (پەســـەنکەر)[812] R1 نیشـــان بدرێ (پاشـــماوەی نەخۆشـــیی میکرۆسکۆپی[813]).

---

[808] Levator muscles
[809] Pelcic wall
[810] Microscopic invasion
[811] Bladder neck
[812] Descriptor
[813] Residual microscopic disease

**N – لیمفەگرێ ناوچەییەکان**

**کلینیکال**

**NX** لیمفەگری ناوچەییەکان بۆ هەڵسەنگاندن نابن.

**No** نیشانەیەک لە میتاستازی لیمفەگری ناوچەییەکان نابینری.

**N1** سەرهەڵدانی میتاستاز لە لیمفەگریدا.

**پاتۆلۆژی**

PNX نموونەیەک لە لیمفەگرێ ناوچەییەکان هەڵنەگیراوە.

pNO میتاستاز لە لیمفەگرێ ناوچەییەکان نابینری.

pN1 سەرهەڵدانی میتاستاز لە لیمفەگرێ ناوچەییەکان.

**M –میتاستازی دوور**

**M0** میتاستازی دوور نابینری.

**M1** سەرهەڵدانی میتاستازی دوور.

**M* – میتاستازی دوور**

M1a میتاستازی دوور لە لیمفەگرێ ناناوچەییەکان دەبینری.

M1b میتاستاز لە ئێسک(ەکان)دا دەبینری.

M1c میتاســـتازی دوور لە ئەندامەکانی دیکە (ســـییەکان، جگەر و هتد...) دەبینری.

* کاتێک میتاستاز پتر لە شوێنێک هەبێ.

## پلەبەندیی هیستۆلۆژیکی (G)

| | |
|---|---|
| GX | خاڵەکانی گلیسن بۆ هەڵسەنگاندن نابن. |
| Gleason ≤6 | بە باشی جیا دەکرێتەوە (ئاناپلازی لە ئاستێکی زۆرن زم و بێبایەخدایە). |
| Gleason 7 | تا ڕادەیەک جیا دەکرێتەوە (ئاناپلازی لە ئاستی مامناوەندیدایە). |
| Gleason 8-10 | بە باشی جیا ناکرێتەوە یان هەر جیا ناکرێتەوە. |

### خاڵەکانی گلیسن[814]

سیستەمی پلەبەندیی گلیسن یاریدەی دیاریکردنی ڕادەی پەرەسەندنی شێرپەنجە، پرۆگنۆز (دوابینی) و هەڵبژاردنی شێوەی دەرمانی نەخۆش دەدا. ئەم پلەبەندییە بەپێی هەڵسەنگاندنی هیستۆلۆژیکیی بیوپسی تان و پۆی تومۆرە و بریتییە لە پلەی ١ هەتا ٥. هەر خاڵێکی گلیسن کۆی دوو پلەی گلیسنە. ڕەوتی بەرزبوونەوەی پلەی شێرپەنجە لە مەترسیی کەمەوە بەرەو مەترسیی زۆرە. پلەی یەک ئاماژە بە تومۆری نزیک بە حاڵەتی ئاسایی دەکا و پلەی ٥ پیشاندەری نەمانی پێکهاتەی (نەخشە، قاڵبی) ڕژێنیی[815] پرۆستاتە، هەروەها لە پێوەندی لەگەڵ ئاستی هێرشکەربوونی تومۆر، بۆ وێنە خاڵی دوو نیشاندەری ئاستی خوارەوە و خاڵی ١٠ ئاستی بەرزی هێرشکەربوونی تومۆرە. هەڵسەنگاندنی خاڵەکانی گلیسن لەم ساڵانەدا گۆڕانی بەسەردا هاتووە. ڕادەی ڕاگەیاندنی خاڵەکانی ٢ هەتا ٥ بە دەگمەن و خاڵی ٧ زۆرتر بووە.

---

[814]Gleason Scale
[815]Glandular pattern

# Gleason Scale




**گرینگیی خاڵەکانی گلیسن بەم چەشنەیە:**

* خاڵەکانی دوو هەتا شەش ئاماژە بۆ ئاستی خوارەوەی تومۆر یان بە باشی جیابوونەوەی تومۆر دەکەن.

* خاڵی ٧ ئاماژە بۆ ئاستی مامناوەندیی تومۆر یان جیابوونەوەی مامناوەندیی تومۆر دەکەن.

* خاڵەکانی ٨ تا ١٠ ئاماژە بۆ ئاستی بەرزی شێرپەنجە یان بە باشی جیانەبوونەوەی تومۆر دەکەن.

## قۆناخەکانی کارسینۆمی پرۆستات

| | |
|---|---|
| قۆناخی I | T1a-c/N0/M0 - PSA <10 – Gleason ≤6<br>T2a/N0/M0 – PSA< 10 - – Gleason ≤6<br>T1-2A/N0/M0- PSA X – Gleason X |
| قۆناخی IIA | T1a-c/N0/M0 – PSA< 20 – Gleason 7<br>T1a-c/N0/M0 - PSA ≥10 but < 20 – Gleason ≤ 6<br>T2a/N0/M0 - PSA < 20 - Gleason ≤ 7<br>T2b/N0/M0 – PSA<20 - Gleason ≤ 7<br>T2b/N0/M0 – PSA X - Gleason X |
| قۆناخی IIB | هەر کام لە Gleason-ەکان - هەر کام لەPSA-یەکان– T2c/N0/M0<br>هەر کام لە Gleason-ەکان - T1-2/N0/M0 – PSA ≥20<br>هەر کام لەPSA-یەکان Gleason ≥8 – T1-2/N0/M0 |
| قۆناخی III | هەر کام لە Gleason-ەکان - هەر کام لەPSA-یەکان – T3a-b/N0/M0 |
| قۆناخی IV | هەر کام لە Gleason -ەکان - هەر کام لەPSA-یەکان - T4/N0/M0<br>Gleason-ەکان - هەر کام لەPSA-یەکان - N1/M0/ هەر کام لە T-یەکان<br>هەر کام لە<br>— هەر کام لەPSA-یەکان – M1/ هەر کام لە N-/ەکان هەر کام لە T-یەکان<br>هەر کام لە Gleasonەکان |

## نیشانەکان

لە دەستپێکدا بە هۆی پەرەگرتنی ئارام و سووکی نەخۆشییەکە، نیشانەیەکی تایبەتی نابینرێ و زۆر جار شێرپەنجە لە کاتی تاقیکردنەوەی پیاوێک کە هیچ نیشانەیەک لەودا سەری هەڵنەداوە، بە هەڵکەوت دیاری دەکرێ. لەوە دەچێ بەپێی پەرەگرتنی نەخۆشییەکە ئەم نیشانانە ببینرێن:

* نیشانەکانی گەورەبوونی پرۆستات وەکو:

- درەنگی لە دەستپێکی میزدا.
- زۆربۆخۆهێنان بۆ ڕاماڵینی میز.
- پەنگخواردنەوەی[816] میز لە میزەڵداندا.
- زووبەزوو میزکردن و هەستکردن بە پڕبوونی میزەڵدان.
- شەوهەستانەوە بۆ میزکردن.
- خوران و برژانەوە لە کاتی میزکردندا بە هۆی چڵکی میزەڵدان یان میزەڕێوە.

* پشتئێشە.

* هماتوری.

* بێئیشتیایی و کزیی نائاسایی بە هۆی شێرپەنجەوە.

* ئێش یان هەستکردن بە نارەحەتیی ئێسک، هەروەها شکانی پاتۆلۆژیکیی ئێسکەکان.

* بەسترانی لیمفەڕەگی لاقەکان و پەنگخواردنەوەی لیمف یان ترۆمبۆزی قووڵە خوێنهێنەرەکان[817]

* ئادنۆپاتی.

* ئانیمی.

* هەراوبوونی لەڕادەبەدەری میزەڵدان بە هۆی گیرانی ڕێی چوونەدەرەوەی میز.

---

[816] Retention
[817] Deep venous thrombosis

## دیاریکردن

کۆنترۆڵکردنی پرۆستات، بە تایبەت پاش تەمەنی چل ساڵی، ڕۆڵێکی بەرچاوی لە دیاریکردنی ئەم نەخۆشییەدا هەیە. لە پیاوانی ٤٠ هەتا ٥٠ ساڵیدا، ساڵی جارێک **تێڕوانینی پرۆستات بە قامک لە ڕێگەی ڕیخۆڵەی ڕاستەوە**[818] و **ئەندازەگرتنی PSA** نەخشێکی بەرچاوی لە ناسینی پێشوەختی ئەو شێرپەنجەیەدا هەیە. لە کاتی شێرپەنجەی پرۆستاتدا میزانی PSA لە خوێندا دەچێتە سەرێ. ڕێژەی PSA بەپێی تەمەنی پیاو بەم چەشنەیە:

| | |
|---|---|
| لە پیاوانی ٥٠ هەتا ٥٤ ساڵیدا | 307 ml/ng |
| لە پیاوانی ٥٥ هەتا ٥٩ ساڵیدا | 4 ml/ng |
| لە پیاوانی ٦٠ هەتا ٦٤ ساڵیدا | 504 ml/ng |
| لە پیاوانی ٦٥ هەتا ٦٩ ساڵیدا | 602 ml/ng |
| لە پیاوانی ٧٠ هەتا ٧٤ ساڵیدا | 606 ml/ng |

گەیشتنی میزانی PSA لە خوێندا بە ١٠ ml/ng یەکێکە لە نیشانە سەرەکییەکانی شێرپەنجەی پرۆستات. یەکیەتیی ئۆرۆلۆژەکانی ئەمەریکا پێشنیاز دەکا تا ڕادەی PSAی پیاوان پاش تەمەنی ٥٠ ساڵی جارێک لە ساڵدا و لەوانەی کە لە بنەماڵەیاندا ئەم نەخۆشییە باو بووە، پاش تەمەنی ٤٠ ساڵ ئەندازە بگیرێ. **تێڕوانینی پرۆستات بە قامک لە ڕێگەی ڕەکتۆمەوە** (لاسەنگی، ڕەقبوون و گرێداربوونی پرۆستات لە نیشانەکانی نائاساییبوونی پرۆستات و شێرپەنجەن)، **سۆنۆگرافیی پرۆستات لە ڕێگەی ڕەکتۆم**[819]، **نموونەهەڵگرتنی ترانسرەکتاڵی** تان و پۆی پرۆستات، **وێناکردنی زرنگانەوەی**

---

[818]Digital rectal examination

[819]Transrectal ultrasonograhy

**موگناتیسی ئێندۆڕەکتاڵی پرۆستات**[820] **هەروەها بەکارهێنانی کامپیوتێرتومۆگرافی/ تومۆگرافیی تەواوی جەستە بە دەردانی پۆزیترۆنەوە و سیتی سکانی ئێسکەکان** یاریدەی ڕەوتی دیاریکردنی شێرپەنجە و مێتاستاز دەدەن.



## چارەسەر

شێوەکانی دەرمانی ئەو نەخۆشانەی کە شێرپەنجەی پرۆستاتیان بە تازەیی دیاری کراوە، بریتییە لە: چاودێری[821]، پرۆستاتئەکتۆمی[822]، ڕادیاسیۆنتراپی، تراپی لە ڕێگەی بێبەشکردن (لەکارخستنی) ئاندرۆژێن[823]، (هۆرمۆناڵتراپی)[824]. هەروەها لەوە دەچێ کەڵک لە شیمۆتراپی وەربگیرێ بۆ ئەوانەی کە تووشی نەخۆشیی مێتاستاتیک بوون. بڕیاری دەرمانکردن لە پێوەندی لەگەڵ هەڵسەنگاندنی

---

[820] Endorectal MRI
[821] Observation
[822] Prostatectomy
[823] Androgen deprivation therapy (ADT), also called androgen suppression therapy
[824] Hormonal Therapy

مەترسییەکانی تەشەنەکردنی شێرپەنجە بۆ ئەندامەکانی دیکە و سەرهەڵدانەوەی شێرپەنجەیە. تەمەنی نەخۆش، لەشساغیی گشتیی[825] نەخۆش و هیوای مەودای ژیان[826] فاکتەرگەلی گرینگن بۆ هەڵبژاردنی شێوەی دەرمانی نەخۆش. بە گشتی، بۆ نەخۆشە بەتەمەنەکانی شێرپەنجەی پرۆستات و ئەوانەی کە هاوکات تووشی نەخۆشیگەلێک بوون کە دەرمان ناکرێن یان هیوای مەودای ژیانیان لە ١٠ ساڵ کەمترە، شێوەی چاودێری و چاوەڕوانیی هۆشیارانە[827] [کۆنترۆڵی ڕێکوپێک و بەردەوامی PSA، بەپێی پێداویستیی دووپاتکردنەوەی بیوپسیی پرۆستات و هەڵسەنگاندنەوەی بارودۆخی نەخۆش و بڕیاردان بۆ هەنگاوە تازەکانیی دەرمانی نەخۆش] لەبەرچاو دەگیرێ، بەڵام لەوانەی کە تووشی شێرپەنجەی پرۆستات بوون بەبێ تەشەنەکردن بۆ ئەندامەکانی دیکە و هیوای مەودای ژیانیان سەرەوەی ١٠ ساڵە، لەوە دەچێ پرۆستاتئەکتۆمی ڕادیکاڵ، ڕادیاسیۆنتراپی یاخود چاودێریی چالاک[828] پێشنیاز بکرێ. چاودێریی چالاک بریتییە لە دواخستنی چارەسەری خێرا لە کاتی پەرەسەندنی نەخۆشییەکە بە مەبەستی ئامادەکاری بۆ دەرمانی چاککەرەوە.

ئەو نەخۆشانەی کە مەترسیی نەخۆشییەکەیان لە ئاستێکی بەرزدایە (T3 و T4، خاڵی ٨ هەتا ١٠ی گلیسن و بە PSAی سەرەوەی ٢٠ نانۆگرام لە میلیلیتردا) و هیوای مەودای ژیانیان کەمە، زۆرتر لە ڕێگەی بێبەشکردنی ئاندرۆژێن یان چاودێری دەرمان دەکرێن، بەڵام کاتی بەرزبوونەوەی مەترسی و زۆربوونی هیوای مەودای ژیان، کەڵک لە ڕادیاسیۆنتراپی لەگەڵ بێبەشکردنی ئاندرۆژێن یان نەشتەرگەری و پاشان چاودێریکردن، ڕادیاسیۆنتراپی یان بێبەشکردنی ئاندرۆژێن وەردەگیرێ (بڕوانە خشتەی چارەسەری

---

825 Overall health

826 Life expectancy

827 Watchful waiting

828 Activesurveillance

سەرەتایی شێرپەنجەی پرۆستات). **پرۆستاتێکتۆمیی ڕادیکاڵ** بۆ ئەو نەخۆشانە لەبەرچاو دەگیرێ کە شێرپەنجەیان لە ئاستی پرۆستاتدا قەتیس ماوەتەوە (T1 و T2) و هیوای مەودای ژیانیان سەرەوەی ١٠ ساڵە. **تەکنیکی نەشتەرگەری بە پاراستنی دەمار**[٨٢٩] ڕادەی سەرهەڵدانی دیسفونکسیۆنی (تێکچوونی کاری) جنسی و میزکردن کەم دەکاتەوە.



**شێرپەنجەی پرۆستات**

829 Nerve sparing(protecting) technique

## خشتەی چارەسەری سەرەتایی شێرپەنجەی پرۆستات

| مەترسی | هیوای مەودای ژیان | شێوەکانی چارەسەری |
| --- | --- | --- |
| نزم | کەمتر لە ١٠ساڵ | چاودێری |
| | زۆرتر لە ١٠ ساڵ و کەمتر لە ٢٠ ساڵ | چاودێری یان<br>ڕادیاسیۆنتراپی یان<br>پرۆستاتئەکتۆمیی ڕادیکاڵ |
| | بەرامبەر یان سەرەوەی ٢٠ ساڵ | ڕادیاسیۆنتراپی یان<br>پرۆستاتئەکتۆمی ڕادیکاڵ |
| مامناوەند | کەمتر لە ١٠ ساڵ | چاودێری<br>چاودێری یان<br>ڕادیاسیۆنتراپی یان<br>پرۆستاتئەکتۆمیی ڕادیکاڵ |
| | بەرامبەر یان پتر لە ١٠ ساڵ | ڕادیاسیۆنتراپی یان<br>پرۆستاتئەکتۆمی ڕادیکاڵ |
| بەرز | کەمتر لە ٥ ساڵ | چاودێری لەگەڵ هۆرمۆناڵتراپی |

| | | |
|---|---|---|
| ڕادیاسیۆنترایی لەگەڵ هۆرمۆناڵترایی یان ڕادیاسیۆنترایی بە تەنها یان پرۆستاتئەکتۆمیی ڕادیکاڵ | بەرامبەر یان زۆرتر لە ٥ ساڵ | |

پاش پرۆستاتئەکتۆمیی ڕادیکاڵ بە چەشنێکی بەرچاو تێکچوونی ڕەوتی ڕەپبوونی ئەندامی سێکسیی پیاو تەنانەت سەرەڕای بەکارهێنانی تەکنیکی پاراستنی دەمارەکان، لە ٢٠٪ هەتا ٦٠٪ی بوارەکاندایە. خۆپێڕانەگیرانی میز[٨٣٠] کەمتر وەبەرچاو دەکەوێ (١٥٪ هەتا ٥٠٪) و لە زۆربەی بوارەکاندا لە ڕێگەی دەرمانی نانەشتەرگەرییەوە[٨٣١] چەند مانگ پاش نەشتەرگەری دەگەڕێتەوە حاڵەتی ئاسایی. شێوە تازەکانی نەشتەرگەری، وەکو لاپراسکۆپی یان ڕۆبۆتیک (میکانیکی)[٨٣٢]، ڕادەی ئاڵۆزییەکانی پاش نەشتەرگەری کەم دەکاتەوە، بەڵام کاریگەریی لە ڕەوتی باشترکردنی ماوەی زیندوومانەوەی نەخۆش نییە. هەروەها بۆ دەرمانی شێرپەنجەی خۆجێیی پرۆستات کەڵک لە ڕادیاسیۆنترایی وەردەگیرێ. بەکارهێنانی ڕادیاسیۆنترایی لە دوو چەشنی ڕادیاسیۆنترایی بە تیشکی دەرەکی یان براکیترایپیە (نزیکدەرمانی) [چاندن یان تێتەپاندنی دەنکی ڕادیۆئاکتیڤ وەکو ڕادیۆئیزۆتۆپەکانی[٨٣٣]، ئیریدیۆمی ١٩٢[٨٣٤]، یۆدی ١٢٥[٨٣٥] و پالادیۆمی١٠٣[٨٣٦] لە نێو پرۆستات]. ڕادیاسیۆنترایی پێشگیری لە سەرهەڵدانی مەترسییەکانی بێهۆشکردنی گشتی[٨٣٧]،

---

830 Urinary incontinence
831 Conservative treatment
832 Robotic
833 Radioisotope
834 Iridium-192.
835 Jod-125
836 Palladium-103
837 General anesthesia

لەنەخۆشـــخـانەکەوتن و ئـالۆزییەکـانی پـاش نەشـــتەرگەری وەکو خوێنبەربوون و چڵککردن دەکا. ڕادەی ســـەرهەڵدانی خۆپێڕانەگیرانی میز لە پێوەندی لەگەڵ ڕادیاسیۆنتراپی لە ئاستێکی نزمدایە، سەرەڕای ئەوەش، بە هۆی ئەوەی کە مـاوەی ڕادیـاســـیۆنتراپی ٦ هەتـا ٨ حەوتووە، ویچوونی ئـالۆزیی وەکو هەوی میزەڵـدان و تێکچوونی ڕەوتی ڕەپبوونی ئەندامی سێکسیی پیاو هەیە. خانەکانی شێرپەنجەی پرۆسـتات بۆ گەشـەکردنیان پێویسـتیان بە تێسـتۆسـترۆن[838] هەیە. خەســـاندن[839] لە ڕێگەی نەشـــتەرگەری یان بەکارهێنانی مادەگەلی شیمیایی کاریگەرییەکی بەرزی لە کەمکردنەوەی ئاستی تێستۆسترۆنی خوێن و ســەرکوتکردنی خانەکانی شــێرپەنجەی پرۆســتات هەیە. بۆ خەسـاندنی شـیمیایی، کەڵک لە **هۆرمۆنەکانی ڕێژەری گۆنادۆترۆپین (GnRH) ئاگۆنیسـت/ئانتاگۆنیسـت**[840] وەردەگیرێ. ئەم دەوایانە دەبنە هۆی بەربەســـتی ڕەوگەی ژێرمێشـــک ڕژێن – باتوو[841] و دابەزینی ڕادەی تێســـتۆســـترۆنی خوێن. **دژەئاندرۆژێنەکان**[842] بەربەســـتکەری وەرگرەکانی ئاندرۆژێن لە خانەکانی شــێرپەنجەی پرۆســـتاتن و زۆر جـار هـاوکـات لەگەڵ هۆرمۆنەکـانی ڕێژەری گۆنـادۆترۆپین (GnRH) ئاگۆنیست/ئانتاگۆنیست بۆ بەربەستی ئاندرۆژێن بە نەخۆش دەدرێن. لەوە دەچێ ئەم دەرمـانـانە هۆی ئـالۆزیی وەکو ســـوورهەڵگەڕان[843]، گەورەبوونی نائاسـایی مەمک[844]، لەپیاوەتیکەوتن[845]، دابەزینی هەستی سـێکســی[846]، قەڵەوی، دابەزینی چڕیی ئێســکەکان[847] و نەخۆشــی خوێنبەرەکـانی کرۆنێریی دڵ بن. لە زۆربەی نزیـک بە تەواوی ئەو

---

838 Testosterone

839 Castration

840 Gonadotropin-releasing hormone(GnRH) agonists/antagonists

841 Pituitary testis pathways

842 Antiandrogens

843 Flushes

844 Gnyecomastia

845 Impotence

846 Reduced libido

847 Osteopenia

نەخۆشـــــانەی کە زینـدوو دەمێننەوە، وێچوونی پەرەســـەنـدنی شـێرپەنجەی پرۆستاتی خۆڕاگر بە هۆرمۆن و نەخۆشیی مێتاستاتیکی پەرەگرتوو هەیە، بەم پێیە، لەوە دەچێ لێرەدا شـیمۆتراپی نەخشـێکی باش بگێڕێ. پێدانی دۆسیتاکسێل[٨٤٨] و پریدنیزۆلۆن بە بەراورد لەگەڵ شـیمۆتراپی لەگەڵ میتۆکسـانترۆن[٨٤٩] دەبێتە هۆی باشـتربوونی ڕەوتی زیندوومـانەوەی نەخۆش بۆ مـاوەی ٣ هەتـا ٦ مـانـگ، مـامنـاوەنـدیی زیندوومانەوەی ئەو نەخۆشـــانە کە لەگەڵ دۆســـیتاکســـێل دەرمان کراون، بە ١٨ مـانـگ دەگـا. لەم دواییـانەدا کـابـازیتـاکســـیـل[٨٥٠] بۆ دەرمانکردنی شـێرپەنجەی مێتاسـتاتیکی پرۆسـتات و سـیپۆلۆیسـەڵ-ت[٨٥١] بۆ شێرپەنجەی پرۆستاتی خۆڕاگر بە هۆرمۆن پەسەند کراوە.

**دوابینی**

مـاوەی زینـدوومـانەوەی نەخۆش بۆ ٥ ســـاڵ بەپێی قۆنـاخەکـانی شێرپەنجەی پرۆستات لە کاتی دیاریکردنیەوە بەم چەشنەیە:

| پلەی شێرپەنجە | ماوەی زیندوومانەوەی نەخۆش بۆ ٥ ساڵ |
|---|---|
| قۆناخی خۆجێیی I | نزیک بە ١٠٠٪ |
| قۆناخی ناوچەیی II | نزیک بە ١٠٠٪ |
| قۆناخی دوور III | ٢٨٪ |

---
848 Docetaxel
849 Mitoxantrone
850 Cabayitaxel
851 Sipuleucel - T

I. قۆناخی خۆجێیی. کاتێک نیشانەیەک لە تەشەنەکردنی شێرپەنجەی پرۆستات بۆ ئەندامەکانی دیکە نییە و بەرامبەرە لەگەڵ قۆناخەکانی I و II.

II. قۆناخی ناوچەیی. کاتێک شێرپەنجە بۆ شوێنی نزیک لە پرۆستات تەشەنەی کردووە. ئەمە بەرامبەرە لەگەڵ قۆناخی III وIV، لەم حاڵەتەدا مێتاستاز بە ئەندامەکانی دوور لە پرۆستات نابینرێ، وەکو تومۆرەکانی T4 و ئەو شێرپەنجانەی کە تەشەنەیان بۆ لیمفەگرێ ناوچەییەکان نزیک (N1) کردووە.

III. قۆناخی دوو بریتییە لە پاشماوەی قۆناخی IVی شێرپەنجە – تەشەنەی شێرپەنجە بۆ لیمفەگرێ ناوچەییە دوورەکان، ئێسکەکان و ئەندامەکانی دیکەی لەش(M1).

# سەرچاوەکان

1- Richard S. Eisenstaedt, MD, FACP: Profesor of Medicine &..... MKSAP Prostate Cancer, p. 89-93, Hematology and Oncology 2015, ACP, USA

2- Gerald W Chodak, MD: Chief Editor: Edward David Kim, MD, FACS more...Prostate Cancer, Updated: Sep 17, 2015, http://emedicine.medscape.com/article/1967731-overview

3- Leitlinien-Detailansicht Prostatakarzinom: Früherkennung, Diagnose und Therapie der verschiedenen Stadien, http://www.awmf.org/uploads/tx_szleitlinien/043-022OLk_S3_Prostatakarzinom_2014-12.pdf

4- Michael J. Zelefsky and... Cancer of Prostate, Cancer , Principles & Practice of Oncology, Volume one, Lippincot Williams& Wilkins, 8th edition 2008

5- Howard I. Scher, Benign and Malignant Disease of the Prostate, Pages 593- 600, Harrison's Princples of Internal Medicine Volume 1, 17th edition 2008

6- Reza Ghavamian, MD: Chief Editor: Jules E Harris, MD, FACP, FRCPC more..., Prostate Cancer Staging , Updated: Sep 06, 2013, http://emedicine.medscape.com/article/2007051-overview

7- Survival rates for prostate cancer, Last Medical Review: 12/22/2014, Last Revised: 03/12/2015, http://www.cancer.org/cancer/prostatecancer/detailedguide/prostate-cancer-survival-rates

8- American cancer Society Overview: prostate cancer 19.October 2012

9- Breslow, C.W. Chan a. u.: Lancet carcinoma of prostate at autopsy in seven areas The international Agency for Research on cancer.Lyons. France in: international journal of cancer Band 20 Number 5 November 1977 S. 680-688

10- Bozzini. P.colin u.a. Focal therapy of prostate cancer. energies and procedures, In: Urologic Oncology: Band 31 Number 2 ,2013. S. 155-167

11- G.D.Steinberg, B.S.Carter u.a.: Family history and the risk of prostate cancer.n: The prostate Band17 Number4 1990 S.337-347

12- G.G.Giles, G.Severi u.a. Sexual factors and prostate cancer in: BJU International 2003 92: S, 211-216, PMID 12887469

13- Großstudie PREFERE bewertet Therapien, Aktuell Urol.2013 Februar 44(02):105 doi: 10.1055_/s-0033-1343926

14- How good is MRI at Detecting and Characterizing Cancer within the prostate? In: European Urology
15- International Agency for research on Cancer (http://globocan.iarc.fr)
16- Kalifornischen Krebses Register 2002 (http://www.ccrcal.org)
17- R.Kraus, B. Matulla -Nolte u.a. UV Radiation and cancer prevention: what is the evidence? In: American Research. Band 26 Number 4A, 2006 Jul Aug.S.2723-2727
18- Lansky E.P., Harrison G. u.a. Long term follow up of phase 2 study of pomegranate juice for men with prostate cancer shows durable prolongation of PSA doubling time.in: The journal of Urology.2009nBand 181 S.295
19- Management of urinary incontinence Following Radical Prostatectomy (http://www.medscape.com/viewarticle_/496416_2), Brian McGlynn ؛ et al., Urol Nurs.2004 ؛ 24(6)
20- Milan S. Geybels, Jonathan L Janet L Stanford u.a.: Statiin Use in Relation to prostate cancer outcomes in a population –based patient Cohort study.In: The Prostate 2013,S n/a-n/a doi:10.1002/pros.22671.
21- Noyes W.R. Hosford, S.E. Schultz (April2008) Human collagen injection to reduce rectal dose during Radiotherapy. In: Int. J Radiat.Oncol Biol.Phys.8285) s.1918-1922
22- Prada PJ, Gonzalez.H, Menendez. C, et al 2009 Bruchytherapy 8(2):s. 210-217.doi:10.1016/jbrachy-2008. 11.910. PMID 19213607
23- Porter C.R., Kodama u.a.: 25-year prostate cancer control and survival outcome s: a.40 year radical prostatectomy single institution series, In: The Journal of Urology: Band 176, number 2, 2006, S.569-574
24- Sonn G.A., Aronson M., S. Lit win, Impact of diet on prostate cancer: a review in: Prostate Cancer and prostatic Diseases 2005, 8, S.304-310
25- So Stromair, Klinikum Coburg, in dem GPG- Sonderheft vom Juli 2007 „Krebsfrüherkennung ohne Mythos"